# دیوانا هادی

سەیدا مەلا محەمەدێ کورێ صبغەتوللاهێ لجەیی

( ل سالا ١٩١٢ زایینی مریە )

بەرهەڤکرن

تەحسین ئیبراهیم دۆسکی

# سەیدا هادی لجەیی
# ودیوانا وی

**پێشەکی :**

هەر ژ ڕۆژا ئێکێ یا دەزگەها ( سپیرێز ) یا چاپ و وەشانێ تێدا هاتیە دامەزراندن هزر ژ لایێ پێڕابوویێن ڤێ دەزگەهێ ڤە د هندێ دا هاتیەکرن کو زێندیکرن وبەلاڤکرنا بەرهەمێ کلاسیکێن مە ئێك ژ ئارمانجێن سەرەکی یێن ڤێ دەزگەهێ بت ، وپێخەمەت ب جهئینانا ڤێ ئارمانجێ کار وخەبەتا خورت هاتەکرن حەتا دەزگەھ شیای د گەل ژیێ خۆ یێ کورت بەرهەمەکێ بەرچاڤ د ڤێ دەلیڤەیێ دا ب چاپێ ڕا بگەهینت ، وپەرتۆکخانەیا ئەدەبیاتا کرمانجی یا کلاسیکی چەندەکێ دەولەمەند بکەت .

و ل دویڤ وێ نەخشەیا ب ڕێك وپێك یا کو ژ لایێ پێڕابوویێن ژێگۆتی ڤە بۆ ساخکرنا دیوانێن کلاسیکێن مە هاتیەدانان ، و د دەلیڤەیا کارکرنا مە دا هەر ژ پێخەمەت ب جهئینانا ڤێ ئارمانجێ مە خواست ڤێ جارێ دیوانەکا دی ژ دیوانێن کرمانجی د کراسەکێ ژێهاتی دا ل بەر دەستێ خواندەڤانێن کورد بدانین ، ئەو ژی دیوانا مەلا محەمەد هادی یێ لجەیی یە ، ئەوێ پتریا ژیێ خۆ د سەدسالا نۆزدێ زایینی دا بۆراندی ، و د گەل بەرهەمێ وی یێ بەرکەفتی ب ڕەنگەکێ ژ هەژی ژ لایێ ڤەکۆلەرێن دیرۆکا ئەدەبیاتا کوردی نەهاتیە ناسین ژ بەر کێم بەلاڤبوونا بەرهەمێ وی ..

هیڤیا مە ئەوە ئەم شیابین ب ڤی کارێ خۆ خزمەتەکا کێم پێشکێشی ڤی شاعری ب تایبەتی ، وئەدەبیاتا کرمانجی ب گشتی بکەین .

**هادی لجەیی کیە ؟**

ژ بـەر کو ئەڤ شاعرە ل بەر گەلەك ژ ڤەکۆلەرێن ئەدەبیاتا کوردی ب خـۆ ـ بەری خەلکێ دی ـ کەسەکێ نەنیاسە ! یا د جـهـێ خۆ دایـە ئـەم ل پێشیێ وی ب کورتـی بدەینـە ناسـینێ ، هێڤێنـێ وی ژ چ جهیــە ؟ کـەنگی و چـاوا ژیایــە ؟ سەرهـاتیا وی یا شـعـری یا ب چ ڕەنگ بوویە ؟ و دیوانا وی یا شعری چ بهایێ خۆ هەیە ؟

ل سەری دێ بێژین : سەیدایێ لجەیی ناڤێ وی یێ دورست محەمەدە ، کوڕێ صبغـەتوللاهێ کـوڕێ رەسـوول پاشـایێ ڕەواندۆزیـە ، وڕەسـوول پاشـا ژی ـ وەکــی دئێتە زانـین ـ برایێ میـرێ سـۆران محەمەد پاشایە ، ئەوێ ب ناسناڤێ میرێ کۆرە دئێتە ناسین ، وهەر ژ بەر ڤــێ چـەندێ هنـدەك جـاران ب نـاڤێ مـەلا محەمـەدێ سۆری ( سۆرانی ) دئێتە ناسین .

لەو مە دڤێت ل سەری و ب کورتی چەندەکێ ل دۆر بنەمالا ڤــی شـاعری یـا ناڤدار باخڤین .

**بنەمالا سەیدایێ لجەیی :**

وەکی مە گۆتی سەیدا مەلا محەمەدێ لجەیی نەڤیێ رەسـوول پاشایێ مـیرێ دویماهیێ یێ میرنشینا سۆرانە ، ئەوا پایتەختا وێ دکەفتە رەواندۆزێ .

وئـەڤ بـنـەمالا میرێن سۆران ئێك ژ بنەمالێن کەڤنێن کوردانـە ، ب سـەدان سالان میراتی ل دەڤەرێ کریـە ، وئێکـەمین کـەس ژ زەلامێـن ڤـێ بنـەمالێ هاتیـە ناسین ئەو بوو ئەوێ دگۆتنێ : ( کلۆس ) وئاشکەرایە کو ( کەلۆس ) ناسناڤێ وی بوو ، و ناڤێ وی یێ دورست نەهاتیە زانین . (١)

---

(١) بڕێنە : پەرتۆکا ( شرفنامە ) یا میر شەرەفخانێ بدلیسی ، بپ ٤٥٣ ژ چاپا دووێ یا محەمەد جەمیل ڕۆژبەیانی وەرگێڕای ، هەر وەسا گۆتارا : ( لمحات تاريخية عن نشأة إمارة سوران ١١٠٠ ـ ١٨٣١ م ) یا دکتۆر ( عبـد الفتـاح علی بـوتـانــی ) کۆڤارا ڤـەژین ، هژمارا ( ٣ ) بـهارا ١٩٩٦ .

ل دۆر هێڤێنێ ڤێ بنەمالێ هژمارەکا گۆتن وبۆچوونێن ژێك جودا هەنە ، بەلێ حەتا نوکە چو ژ ڤان گۆتنان ب ڕەنگەکێ زانستی نەهاتینە بنەجهکرن .

هەر ژ دەسپێکا حوکمداریا ڤێ بنەمالێ ـ ل دۆرێن سەدسالا دووازدێ زایینی ( شەشێ مشەختی ) ـ و حەتا دەولەتا ئۆسمانی ل نیڤا ئێکێ ژ سەدسالا نۆزدێ زایینی ( سێزدێ مشەختی ) دویماهی بۆ ڤێ حوکمداریێ دانای ، کو نێزیکی حەفت سەد سالان ڤەدکێشت ، پایتەختا حوکمداریا ڤێ بنەمالێ ژ چەند جهەکان هاتیە ڤەگوهاستن ، وەکی : ( هاودیان ، دوین ، ئەربیل ، شەقلاوە ، حەریر ، خلێفان ) و دویماهیێ ( رەواندۆز ) .

وناڤدارترین میرێن ڤێ بنەمالێ میر محەمەدێ کوڕێ موصطەفا بەگێ یە ئەوێ ب ناسناڤێ میرێ کۆرە هاتیە ناسین [1] ، و ژێدەرێن دیرۆکی دبێژن : میر مصطەفای ئەوێ چار کوڕ ل پاش خۆ هێلاین ( محەمەد ، ورەسوول ، وسلێمان ، وئەحمەد ) ل دۆرێن سالا ١٢٢٣ مشەختی ( ١٨٠٨ زایینی ) دەست ژ میراتیێ ڤەکێشا و کوڕێ خۆ یێ مەزن محەمەد ل شوینا خۆ دانا ، و ژ بەر کو میر محەمەد مرۆڤەکێ خودان شیان و ب هێز بوو شیا نێزیکی سیه سالان حوکمداریێ بکەت ، و ل سەر دەمێ وی گەلەك ڕویدان و سەرهاتیێن مەزن چێ بووبوون دەلیڤە دەست نادەت ل ڤێرێ بەحس ژێ بکەین ، بەلێ تشتێ مە دڤێت بێژین ئەوە : ئەڤ میرە شیابوو توخوبێن میرنشینا گەلەك بەرفرەه بکەت ، وگەلەك دەڤەران بێختە بن دەستێ خۆ ، تشتێ بوویە ئەگەرا هندێ دەولەتا ئۆسمانی ب چاڤێ ترسێ بەرێ خۆ بدەتێ ، ب تایبەتی ئەگەر ئەم ل بیرا خۆ بینین کو ل وی دەمی گەلەك میر وحاکمان بەرگەڕیان دکر کو خۆ ژ بن حوکمێ ئۆسمانیان ڕزگار بکەن .

---

(١) ل دۆر ژین وسەرهاتیا ڤی میرێ مەزن برێنە پەرتۆکا : ( الأمیر الکردي میر محمد الرواندزي ) ژ نڤیسینا جەمال نەبەز ، وەرگێڕان بۆ زمانێ عەرەبی فەخری سلاحشۆر ، چاپا دووێ ، ئەربیل ٢٠٠٣ .

ل سالا ١٢٥٢ مشەختى ( ١٨٣٦ زايينى ) هێزێن ئۆسمانيـان شـيان مـيرێ كۆره بـگـرن ، پشتى ميرى خۆ ب دەست وان ڤە بەرداى ، و وان مير هنارتە سـتەنبۆلێ ل نك سولتانى ، و دبێژن : پشتى سولتانى مـير محەمـەد عـەفووكرى ، وبهايـەكێ مەزن دايى ، و ل دەمێ زڤرينێ بڕيار هاتە دان مير بێتە كوشتن ، ووەسا چێبوو ، دبێژن : واليـێ سێواسێ ب فەرمانا سولتانى مير محەمەد كوشت !

دەمێ مير محەمـەد بـەر ب سـتەنبۆلێ ڤـە هاتيـە هنـارتن و چونكـى يـێ بـێ دووندەه بوو برايێ خۆ ئەحمەد بـەگ ل شـوينا خـۆ دانـا ، ودەمـێ مـير محەمـەد نەزڤرى ئەو ل شوينا وى بوو ميرێ رەوانـدۆزێ ، وپشـتى دو سالان و د ئـەنجامێ پيلانـەكێ دا يا پسمامێن وى پێ ڕابووين هاتە كـوشـتـن ، لـەو برايـێ وى يـێ دى سلێمان بەگ ل جهێ وى بـوو مـيـر ، و ژ بـەر كـو مـيـر سـلێمان مـرۆڤەكێ لاواز بـوو بـرايـێ وى رەسـوول بـەگ ( ئـەوێ پـشـتـى هنگى بوويە رەسوول پاشا ) ژ ئامێديێ ڤەگەڕيا رەواندۆزێ و ل شوينا وى بوو مـير ، و ئـەڤ رەسـوول پاشـايە دئێتە هژمارتن ميرێ دويماهيێ يێ ڤێ ميرگەها دێرين .

و رەسوول پاشا هێشتا ل سەر دەمێ حوكمداريا بابێ خۆ ، بەرى سالا ١٨٠٨ ز حوكمداريا هندەك دەڤەرێن مـيـرگـەهـێ وەرگـرتبوو ، و دەمێ برايێ وى محەمەد بوويە ميرێ سۆران هندەك كارێن ميرنشينێ يێن گرنگ كرنە د دەستان دا وەكـى سەرلەشكەريێ ، وپشتى مير محەمەدى هێرش كريە ميرنشينا بادينان و ئێخستيە بن دەستێ خـۆ حوكمداريـا ئـامێديێ كـرە د دەسـتان دا ، ودەمـێ رەسـوول پاشـاى ديتى برايێ وى مـير سـلێمان ژ بـەر لاوازيـا خـۆ نـەشـێـت حوكمداريـەكا ب هـێز بكەت ، نەچار بوو قەستا رەواندۆزێ بكەت ، و ل شوينا برايێ خۆ ببتە مير .

و ژ بـەر كـو رەسـوول بـەگ وەكـى بـرايـێ خۆ مير محەمـەدى مرۆڤـەكێ ب هممەت بوو ، بەرگەڕيان كر مەجدا باب وباپيران ڤەگەڕينت ، و ئـەڤ چـەندە ل دلێ دەولـەتا ئۆسمـانى نـەهات ، وهـەر زوى پـەيوەنديێن وى و دەولـەتـێ تێـك چوون ، پشتى بوويە مـير ب حەفت سالان ، و ب دورستى ل سالا ١٨٤٧ ز بڕيـار دا خويكا سالانە نەدەتە دەولـەتێ ، لـەو واليـێ بـەغدا يـێ ئۆسمـانى نـەجيب پاشـاى

هێرشەکا دژوار کرە سەر میرنشینا وی ، و پشتی چەند شەڕەکێن گران لەشکەرێ سۆران شکەست ، و میرێ وان رەسوول پاشا نەچار بوو بڕەڤت و بەر ب کوردستانا ئیرانێ ڤە بچت ، و پێنج سالان ل باژێڕێ ( شنۆ ) ئاکنجی بوو ، پاشی دەولەتێ عەفیا وی دا ب شەرتەکی ئەو ل دەڤەرێن عەربان ل عیراقێ ئاکنجی ببت .

وپشتی زڤڕی بوو ( موتەصررفێ ) بەغدا بۆ دەمەکی ، پاشی ل سالا ١٢٧٦ مشەختی ( ١٨٦٠ زایینی ) هاتە ڤەگوهاستن بۆ وانێ و ل وێرێ بوو والی .

و ژ بەر خزمەتا وی د ناڤ لەشکەرێ ئۆسمانی دا ل شەڕێ قرەم روتبا ( پاشا ) بۆ هاتە دان ، وبۆ دەڤەرا قەرسێ پاشی ئەرزەڕۆمێ هاتە ڤەگوهاستن حەتا ل وێرێ مری ل سالا ١٢٩٨ مشەختی ١٨٨١ زایینی .

و وەکی دیار رەسوول پاشای دەمێ خۆ یێ دویماهیێ ل هندەك دەڤەرێن جودا جودا ژ باکوورێ کوردستانێ بۆراندیە ، و هەر ل وێرێ مریە ژی ، لەو گەلەك ژ دووندەها وی ژی ـ پشتی مرنا وی ـ مابوونە ل وێرێ ، وئێك ژ وان بابێ شاعرێ مە مەلا محەمەدی ( صبغەتوللاھ ) بوو کو دبتە کوڕێ رەسوول پاشای .

وهەژی گۆتنێ یە بێژین : نەڤیێ مەلا محەمەدی ، سەیدایێ هێژا محەمەد جەمیل سەیدا د ژینەنیگارا باپیرێ خۆ دا دبێژت : محەمەد هادی ( سەیدا ) کوڕێ صەبغەتوللاهە ، ئەو ژی کوڕێ رەسوول پاشایێ رەواندۆزێ سۆری یە ، ئەو ژی برایێ کۆر محەمەد میرێ سۆری یە . (١)

بەلێ دەمێ مرۆڤ ل وان ژێدەران دزڤڕت یێن بەحسێ رەسوول پاشای دکەن تێدا دبینت کو وی پێنج کوڕ هەبوون : ئەسعەد و فەتاح و رەشید و بارام و ئحسان ، و د چو ژێدەرێن بەردەست دا من نەدیت هاتبت کو وی کوڕەك ب ناڤێ صبغەتوللاھ هەبت ، ڤێجا ئەز نزانم ژێدەران ئەڤ ناڤە ژ بیرکریە ، یان ژی دبت صبغەتوللاھ نەڤیێ وی بت نە کو کوڕێ وی بت !! هەر چاوا بت تشتەکێ

---

(١) بڕێنە پەرتۆکا : ( نضال جمیل سیدا ) ژ نڤیسینا محمد جمیل سیدا ب زمانێ عەرەبی ، چاپا سالا ٢٠٠٠ ، بپ ( ٢٠ ) .

مسۆگەرە ل نك خەلكێ دەڤەرێ كو سەیدایێ لجەیی ژ بنەمالا رەسوول پاشایە ، وهەر ژ بەر ڤێ چەندێ خەلكی دگۆتە مەلا محەمەد هادی : مەلایێ سۆری ، ئانكۆ : مەلایێ سۆرانی ب زاراڤێ خەلكێ دەڤەرێ .

**ژین وسەرهاتیا لجەیی :**

ژین وسەرهاتیا سەیدا محەمەد هادی لجەیی ب بەرفرەهی مە نەزانیە ، ویا ئەم ژێ دزانین ـ وەكی د ژێدەران دا هاتی ـ ب تنێ ئەڤەیە : پشتی باپیرێ وی رەسوول پاشا بۆ باكۆرێ كوردستانێ هاتیە ڤەگوهاستن دا ببتە والیێ وانێ پاشی یێ ئەرزرۆمێ ل دۆرێن سالا ١٢٧٦ مشەختی ( ١٨٦٠ زایینی ) ، وی مالا خۆ وعەیالێ خۆ ژی د گەل خۆ ئینا ، وپشتی ئەو ل ئەرزرۆمێ مری هندەك ژ عەیالێ ما ل وێ دەڤەرێ وبوونە ئاكنجییێن باكوورێ كوردستانێ ، وئەڤ بنەمالە ل وێرێ ب ناسناڤێ سۆری ( یەعنی : سۆرانی ، ب زاراڤێ خەلكێ دەڤەرێ ) هاتنە ناسین ، و ل دەمەكی بابێ وی ( صبغەتوللاھ ) هاتە قەزا ( لجێ ) ئەوا سەر ب ویلایەتا ( دیاربەكر ) ێ ڤە ، و ل وێرێ ئاكنجی بوو ، و ل لجێ كوڕێ وی محەمەد مەزن بوو و ب ناڤێ وێ هاتە ناسین .

ل دۆر دەم و جهێ سەیدا محمەد لجەیی لێ هاتیە سەر دنیایێ د ژێدەرێن ل بەر دەست دا مە چو نەزانیە ، بەلێ ب نیشانان وەسا دیار دبت كو یا بەرعەقل ئەوە بوونا وی پشتی سالا ١٨٦٠ ێ بت ، ژ بەر كو ئەو نە گەهشتبوو ببتە ئێك ژ خەلیفێن شێخ ( عەبدررەحمانێ تاغی ) ئەوێ ل سالا ١٣٠٤ مشەختی ( ١٨٨٦ زایینی ) مری ، بەلكی ئێك ژ شاگردێن خەلیفەیێ وی شێخ ( عەبدلقادرێ هیزانی ) بوو وەكی دێ بۆ مە ئاشكەرا بت .

سەیدایێ لجەیی د زانینێن شەرعی دا پێشكەفت بوو ، وئجازا مەلاتیێ ژی ستاندبوو ، بەلێ مە نەزانیە كانێ وی ئەو ئیجازە ژ كیژ زانایی وەرگرتیە ، و د علمێ شریعەتی دا و ب تایبەتی د فقهی وئوصوولی دا زانایەكێ ژێهاتی بوو .

وهــەر چــەنــدە وی ناسناڤێ خۆ د شعرێ دا کربوو ( هادی ) ژی بەلێ ئــەو د ناڤ خـەلـکـێ دەڤـەرێ هەمیێ ب ناسناڤێ ( سەیدا ) دهاتە ناسین .

د صــووفـیــاتــیــێ دا سەیدا ژ دویکەفتیێن ڕێبازا نەقشەبەندی بوو ، وئێـك ژ خــەلیفێن شـێخ عــەبدلقادرێ هـیزانی بـوو ، و ژ بــەر کـو شــێخێ هــیزانی کارتێکرنەکا مـەزن ل ســەر سـەیـدایـێ لجـەیـی هەبوو ـ وەکی ژ دیــوانا وی دیـار دبــت ـ مـە دڤێت ل ڤێرێ وی ب کورتی بدەینە ناسین .

**شێخ عەبدلقادرێ هیزانی :**

شێخ عەبدلقادر کوڕێ مەلا عەبدللاهێ شەمەرشێخیـیە ، دبێژن : ئەڤ مەلا عەبدللاهــە ژ پســامێن مــەلا خــەلیلێ ســێرتیـیە ( ١١٦٤ ـ ١٢٥٩ مشـــەختی ) وهەڤالینی د ناڤبەرا هەردووان دا هــەبوو هێشـتا ل دەمـێ فـەقیاتیێ ، ودەمــەکی هــەردو ل هـیزانێ بـوون پاشـی مـەلا خـەلیل چـوو ( سـێرتێ ) ئـاکنجی بـوو [1] ، ومەلا عەبدللاه چوو گوندێ ( شـەمەر شـێخ ) ولێ ئـاکنجی بـوو ، و هــەر ل ڤــی گـونـدی ل سـالا ١٢٧٠ مشەختی ( ١٨٥٣-١٨٥٤ زاییـنی ) مربوو . [2]

ڤی مەلا عەبدللاهی کوڕەك هــەبــوو دگــۆتــنــێ : مەلا عـەبدررەحمان ، و ب ناڤـێ مەلا عەبدررەحمانێ مەلاکەندی دئێنە ناسکرن ، ژ هەڤال وشـاگردەیێن ( غەوسـێ هـیزانی ) سـەیید صبغـەتوللاهێ هـیزانی بـوو ، وســـەیدایێ مـــەلا عەبدررەحمانێ تـاغـی بـــوو ، زانـا وشـاعرەکێ زیـرەك بـوو ، هنـدەك شـعرێن وی یێن کرمانجی مــە دیتینـە ، ل گونـدێ مەلاکـەندێ ل سـالا ١٢٨٩ مشـەختی ( ١٨٧٢-١٨٧٣ زاییـنی ) چوو بوو بەر دلۆڤانیا خودێ .

---

(١) ل دۆر ژیـن وسـەرهاتی وبەرهەمێ مەلا خەلیلی بڕێنە کتێبا مە ( ل دۆر ئەدەبێ کرمـانجی ل سەدسالا نۆزدێ وبیستێ ) ئەوا ل هەلێرێ چاپ بووی ل سالا ٢٠٠٤ ، بپ ٥٦-٦٨ .

(٢) بڕێنە : ( برکة الکلمات في مناقب بعض السادات ) یا شـیخ ( محمـد عـاصم بـن محمـد عـلاء الدین بن الشیخ فتح الله الورقانسي ) بپ ١٨٩-١٩٠ .

وكورێ دی یێ مەلا عەبدللاهی شێخ عەبدلقادر بوو ئەوێ ئاخفتن ل سەر ، سالا بوونا وی ب دورستی مە نەزانیە ، بەلێ تشتێ ئەم دزانین ئەوە ل سالا ١٢٧٠ مشەختی بابێ وی مەلا عەبدللاه ـ وەکی مە گۆتی ـ مربوو .

پەیوەندیێن وی د گەل سەیید صبغەتولاهێ هیزانی ( ل سالا ١٨٧٠ زایینی مربوو ) ب هێز بوون ، وئەو خەلیفێ مەلا عەبدررەحمانێ تاغی ( ١٨٨٦ زایینی مربوو ) یێ ئێکێ بوو د رێبازا نەقشبەندی دا .

مرۆڤەکێ زانا وشاعر بوو ، شعر ب کرمانجیەکا رەهوان دنڤیسین ، وکۆمەکا شعرێن وی یێن کرمانجی مە د کتێبا خۆ دا ( ل دۆر ئەدەبێ کرمانجی ) بەلاڤکرینە . (١)

وەکی مە گۆتی مەلا محەمەد هادی ژ خەلیفەیێن ڤی شێخ عەبدلقادری بوو ، و ژ شعرێن وی دیار دبت کو وی ب چاڤەکێ زێدە بلند بەرێ خۆ ددا ڤی شێخێ خۆ ، ودیار کاتێکرنا هیزانی د لجەیی دا نە ب تنێ ژ لایێ صووفیاتیێ بوویە ، بەلکی د لایێ ئەدەب وشعرێ ژی ئەڤ کارتێکرنە هەبوویە ، وهەر کەسەکێ شعرێن وان هەردووان هەڤبەری ئێك بکەت ئەڤ چەندا مە گۆتی ب رەنگەکێ زێدە ئاشکەرا دێ بۆ بەرچاڤ بت .

هژمارەکا ئەدیب وزانایێن هێژا زانین ژ سەیدایێ لجەیی وەرگرتیە وشاگردێن وی بووینە ، ژ وان : عەبدلفەتتاحێ حەزرۆیی یێ شاعری ئەوێ د شعرێ دا ناڤێ ( فەتحی ) ل سەر خۆ دانای (٢) ، ومەلا ئەحمەدێ خاسی ، ومەلا

---

(١) د بەرپەرێن ١٦٦-٢٠٨ دا ، وهەر ل وی جهی مە ئەڤ شاعرە ب کورتی ژی دایە ناسینێ ، وپشتی چاپکرنا کتێبێ ئەم ژ نوی ب سەر هندەك زانینان ل دۆر بنەمالا وی هلبووین لەو ل ڤێرێ مە نڤیسینە .

(٢) هندەك بەرهەمێ ڤی شاعری ژی یێ کرمانجی مە د کتێبا خۆ یا ناڤ بۆری دا ئینایە ل بەرپەرێن ٢٢٩-٢٤١ ، پاشی دانەیەك ژ دەسنڤیسا دیوانا وی ب دەست مە کەفت ، وبەلکی ل دەمەکێ داهاتی دیوانا وی ب تمامی بۆ چاپێ بەرهەڤ بکەین ، ئەگەر خودێ حەز بکەت .

روشدى ئەفەندى كوڕێ خۆجە سەعيدى كو ئەو ژى شاعر بوو ودو شعرێن وى ب مرنا سەيدايێ لجەيى ڤەهاندين ل بەر دەستێ مەنە ، ومەلا عەبدللاهێ قۆغى ، وگەلەكێن دى .

**مرنا سەيدايێ لجەيى :**

سەيدا مەلا محەمەدێ لجەيى ل ٢٣ هەيڤا موحەررەمێ ژ سالا ١٣٣٠ مشەختى ( ١٣ / ١ / ١٩١٢ زايينى ) ل ( لجێ ) چوويە بەر دلوڤانيا خودێ ، ومرنا وى كارتێكرنەكا مەزن د شاگردێن وى دا كربوو ، وئێك ژ شاگردێن وى يێن شاعر كو مەلا رشدى ئەفەندى بوو دو شعر ئێك ب كوردى وئێك ب عەرەبى ب مرنا وى ڤەهاندينە ، د شعرا ئێكێ دا ئەوا ب زمانێ كوردى ڤەهاندى دبێژت :

ئيرۆ حەتا سەر وپا جانێ مە گرتى ئاگر
لەورا كو قوطبێ سۆرى ژ دارێ فەنا جودا كر
عالەم ژ هەردو چەشمان لەو ئابێ خوين دڕێژن
سەيدايێ خاص وعامان ساعەت ل سەر مە ڕاكر
ڕاكر ل مە قيامەت وى پيرێ پڕ كەمالى
دونيا دنێ طەلاق دا عەقلێ مە وى هەبا كر
سەيدا بوو رەوضەئێ گول عالەم ژ بۆ وى بولبول
مەدحێ وى نائێ گۆتن حەيفە ژ مە رەها كر
مانەندى باغێ عرفان حەى كر وى جنن وئنسان
تەركا حەياتێ وى دا فەردەوس ئختيار كر
سەيدايێ چاڤ بەلەك بوو طبعەت ب خوە مەلەك بوو
فەيضا ل بال گەلەك بوو پيران ژ بۆ ثەنا كر
مەقصوود وى نە قوصوور بوو نە مال ونە سوروور بوو
نە جەننەت ونە حوور بوو قەصدا لقا خودا كر

شـەيخ ومـەلا و طوللاب صووفى پير وهەم شەباب

وان دل ژ خـويـن تـەژيـنـە دۆران ل مـە وها كـر

بـەحـرا عـولـووم وهممەت دەريايێ فـەيض ورفعەت

سـەرچـەشمـەيا طـەريـقـەت پشتا مەلان دوطا كر

ئـوسـتـاذ حـەفـت ئـقـليم مەحبووبێ خاص وعامان

غـەوثـێ زەمـان بـوو هـادى سـەيدا بوو كەنزێ زاخر

پـيرێ طەريـقـێ شـەيـخان ئـەو هاديێ گوهەر زێڕ

ژ دونـيـايـێ تـە بـار كـر خـەلقێ قوبوورا شا كر

( بـشـرى لأهـل قـبـر صـاروا لهادي جارا

قـد فـازوا بـالـسـلام وامـتـازوا بـالمـفـاخـر )

عـەللامـەئـێ شەهيـرە ئوسـتـاذێ قـوطبـێ دينە

هادى بـوو دەسـتـەگـيرە ( ﷲ ) ئـەو بـوو زاخـر

مـەحـرووم نـەكـى ئيلاهى مە ژ روئيەتا وى شاهى

دائـم مـە ئـەو نـيـازە دەر بـاطـن و ب ظـاهـر

روشـدى حـەزيـنـێ دينـە كارێ وى تـم ئەنينە

جارەك وى بـير خـوە بـيـنـە لـەورا ئـەسـيـرە قاصر

و د دويماهيا شعرا خۆ يا عەرەبى دا دبێژت :

قـد مـضـى ثلثان من شهر المحرم وثلا

ثـة أيام تـوفـي ذاك شـمـس العارفين

عـمّ بـالإسـلام داء مـا لـه قـط دواء

غـيـر صبر فاصبروا والله خير الصابرين

صار تاريخ انتقال الهادي لفظ ( شغل )

فـاز بـالـخـلـد مـع الأحباب فيها داخلين

لـو أصـاب الـجـمـل مما ابتلى رشدي به

سـكـنـوا جـنـات عـدن كـل قـوم كافرين

وحسێبا ئەبجەدی یا پەیڤا ( شغل ) ب ڤی ڕەنگیە : ( ش ) ٣٠٠ + ( غ ) ١٠٠٠ + ( ل ) ٣٠ = ١٣٣٠ .

ومەلا محەمەد هادی پشتی مری چار کوڕ ودو کچ ل پاش خۆ هێلان : مـەلا محەمەد ، وحەجی عەبدصەمەد ، وجەمیل ، ومەلا بەشیر ، وساميا وعەنبەر .

**بەرهەمێن لجەیی :**

مـەلا محەمـەد جـەمیل سـەیدا نـەڤیێ سـەیدایێ لجـەیی ئاشـكەرا دكـەت كـو باپـیـرێ وی مــەلا مـحـەمـەدێ لجەیی هژمارەكا نڤیسین وبەرهەمێن جودا جـودا د بابەتێن دینی دا هەبوون ، بـەلـێ مخابن پشتی سەرهلدانا شێخ سـەعیدێ پـالۆ ل سالا ١٩٢٥ زاییـنـی شكەسـتی ولەشـكەرێ تركـان ب سـەر دەڤـەرێ دا گرتـی ئـەڤ نڤیسینە ـ وەكی گەلەك بەرهەمێن دی یێن زانایێن كورد ـ هاتــنـــە ســۆتــن ، و ب تنێ دو بەرهەم ژ بەرهەمێن وی پارستی مان ، ئەو ژی ئەڤەنە :

١ ـ كتێبەكا بچویك ب زمانێ كوردی ل دۆر علمێ تەجویدی .

٢ ـ دیوانا وی یا شعری ، ئەوا نوكە مە ل بەر دەستێن خواندەڤانان دانای .

**دیوانا شعرێن لجەیی :**

دیوانا سەیدایێ لجەیی دئێتە هژمارتن ئێك ژ دیوانێن كرمانجی یێن گرنــگ یێن كو ل سەر ڕەنگێ كلاسیكی هاتینە ڤەهاندن ، وئەوێ ڤێ دیوانێ بخوینت دێ باش بــۆ دیــار بـت كو ( هادی ) شاعرەكێ زیرەك بوویە ، وبەرگەڕیان كریـە كـو ل سەر ڕێبازا مەلایێ جزیری وئەحمەدێ خانی د ڤەهاندنێ دا بچت .

ووەكی ئاشكەرا دیوان ژ سێ پشكان پێك دئێت ، د پشـكا ئێكـێ دا ئـەو شعر هاتینـە كۆمكـرن یێـن كـو شـاعری د مــەدحا شــێخێن خــۆ یێــن نەقشــبەندی دا ڤەهاندین ، و ب تایبەتی د مەدحا شێخ عەبدلقادرێ هیزانی دا ، بێی ڤان شعران

ل دویـڤ حــەرفا قافیێ ب ڕێز بکەت وەکی کو د دیوانێن کرمـانجی دا هەی ، و د پشکا دووێ دا وی شعرێن خۆ ، وپتریا وان د بابەتێ صووفیاتی وغەزەلێ دانـه ، ل سـەر تەرتیبا حەرفێن قافیێ ب ڕێزکرینه ، وپشکا سییێ ئـەو شعرن یێـن وی ل سەر شعرێن جزیری دانایین ، وئـەو شعر ژی یێـن وی ل دۆر مرنـا شـێخێ خـۆ ڤەهاندین ، ومە ژی ل ڤێرێ وەکی تەرتیبا شاعری دیـوان ل بـەر دەست دانایـه ، ژبلی ژێك جوداکرنا هەر سێ پشکان .

**ئەڤ دیوانه :**

ئەڤ دیوانا نوکە ئەم ل بەر دەست یا پێکهاتیه ژ ( ٦٣ ) شعران ، وئەو شـعر ب چار زمانان دڤەهاندینه : بارا پتر ب زمانێ کوردینه زاراڤێ کرمانجی ، وکتەکا کێم ژێ ب عەرەبینه ، وکێمتر ب فارسـی وترکینـه ، تشتێ هنـدێ دگـەهینت کـو سەیدا هادی لجەیی شارەزایی د ڤان هەر چار زمانان دا هەبوو .

وکارێ مە د بەرهەڤکرنا ڤێ دیوانێ دا د ڤان خالێن ژێری دا کۆم دبن :

١ ـ ئەڤ شعرە مە ژ دەسنڤیسا دیوانێ وەرگرتینـه ئـەوا ل سـالا ١٩٨٧ زایینـی ب دەستێ مەلا ئەحمەدێ کوڕێ مـەلا ئەحمـەدێ جـووزی یـێ مەغنیسانی هاتیـه نڤیسین ، و ب ڕەنگێ وێنـەکرنێ ل دیاربـەکرێ هاتیـه بـەلاڤکرن ، ڕێنڤیسا ڤـێ دەسنڤیسێ یـا کەڤنـه ، وەکـی وێ ڕێنڤیسا مـەلایێن کـورد بـەرێ پـێ دنڤیســی ، وئاشکـەرایـه کــو خوانـدەڤانێ کورد ل لایێ مە ئـەڤرۆ نـەشێـت ڤـێ ڕێنڤیسی ب ساناهی بخوینت ومفایی ژێ وەربگرت ؛ لەو مە ئەو ب ڕێنڤیسا کوردی یا نوی نڤیسی .

٢ ـ حەتا کو خـوانـدەڤانێ ڤێ دیوانێ خودانێ دیوانێ بناسـت ئـەم ل چـەند ژێدەرکان زڤڕینه ، ب تایبەتی وێ نامەیا هێـژا مـەلا محەمەمـەد جـەمیل سـەیدا ـ نەڤیێ شاعری ـ د دەرحەڤا خەباتا بابێ خـۆ دا نــڤـیــســی وچەند سەر قەلەمك ژ ژینەنیگارا باپیرێ خۆ ژی ڤەگێڕاین ، وئـەڤ کتێبـه ب زمـانێ عـەرەبی ل سـالا ٢٠٠٠ چاپ بوویه .

٣ ـ ئەگـەر جهـەك ژ شـعرێن سـەیدای هەوجـەیی ب ڕوهنكرنـەكێ یـان تەعلیقەكێ هەبت مە ل پاشیا شعرێ ئەڤ چەندە كریە ، وچـەند پـەیڤێن گـران ژی ئـەوێن شـعران دا هـاتین ، ب تایبـەتی پـەیڤێن فارسـی ، مـە ل دویماهیـا هـەر شعرەكێ شرۆڤە كرینە ، پشتی ئەم ل هژمارەكا فەرهەنگان زڤڕین .

هیڤیا مـە ئـەوە چاپكرنـا ڤـێ دیوانـێ دەولەمەنیـەك بـت بـۆ پەرتۆكخانـەیا ئەدبێ كلاسیكی یێ كرمانجی .

تەحسین ئـیـبـراهیم دۆسكی

دهۆك ل نەورۆزا سالا ٢٠٠٥

١

# ذنوبي سوّدت صحفي

ذنـوبـي سـوّدت صحْفي    وحلّ بـي حـمى رجْفي
مـددت نــحـوكـم كـفّي    لنا اشـفـع يا رسـول الله
أغـثـنـا يا حـبيب الله [1]

أنا الـعـاصي أنا الـنـاسي    أنا الـقـاصي مـن الـناس
ومــنــفــور لــجُـلاســي    لنا اشـفـع يا رسـول الله
أغـثـنـا يا حـبـيـب الله !

ومــــرّت بـــيَّ أزمـــان    وفـيـهـا صنعي عصيان
ومـا لــي قــط إحــســان    لنا اشـفـع يا رسـول الله
أغـثـنـا يا حـبـيـب الله !

وحـلّ بـعـارضـي الشيب    وأمـري الـذنــب والعيب
وما فـي فـضـلـك الريب    لنا اشـفـع يا رسـول الله
أغـثـنـا يا حـبـيـب الله !

وجـدت الـقـلـب عميانـا    عــن الإخـلاص عـريانـا
لــقــد زرتــك نـدمـانـا    لنا اشـفـع يا رسـول الله
أغـثـنـا يا حـبـيـب الله !

فسبحان الذي أسرى بطه عبده فخرا
رأى ما لا نرى أمرا لنا اشفع يا رسول الله

أغثنا يا حبيب الله !

لقد ناداكَ مولاكَ وبالأسرار ناجاكَ
وما ترضاه أعطاكَ لنا اشفع يا رسول الله

أغثنا يا حبيب الله !

وحيّاك بـ ( لولاك ) [٢] ( لعمركْ ) جاء جدواك
( لسوف ) حق مرضاك لنا اشفع يا رسول الله

أغثنا يا حبيب الله !

لليلِ الشعر ( والليل ) يشير ( والضحى ) يملي
بهاء الوجه من خلّي لنا اشفع يا رسول الله

أغثنا يا حبيب الله !

لشرح صدرك الزين ( ألم ) يكفيك يا عيني
وما مدح بلا مين [٣] لنا اشفع يا رسول الله

أغثنا يا حبيب الله !

لبدر شقَّ ذا البدر وما يدريك ما بدر
لكل الكون هوْ فخر لنا اشفع يا رسول الله

أغثنا يا حبيب الله !

وما حدّك يا هادي تعد المدح للهادي
نبي الله بالنادي لنا اشفع يا رسول الله

أغثنا يا حبيب الله !

أتـــيـــتُ بـابـك الـعـالـي　　　بــعــيــن ذات هــطّــال

وبــالٍ حَــــــزِنٍ بــــال　　　لنا اشـفـع يا رسـول الله

أغـثـنـا يا حـبـيـب الله !

مـضى عمري على اللهو　　　ومـا أيـقـظت عن سهوي

ونــفــســي للهوى تهوي　　　لنا اشـفـع يا رسـول الله

أغـثـنـا يا حـبـيـب الله !

لـذيـذ الـعـيـش ألـهاني　　　ومـا لاحـظـت أكـفاني

إذا مـا هــي تـغــشـاني　　　لنا اشـفـع يا رسـول الله

أغـثـنـا يا حـبـيـب الله !

فـتـب ربـي عـلى عبدِ　　　جـنـى ذنـبـاً على عـمدِ

لـكي يـأمـنَ مـنْ كـيـدِ　　　لنا اشـفـع يا رسـول الله

أغـثـنـا يا حـبـيـب الله !

تـضـرّع وتبهّل جهرا (٤)　　　وقـل رب اغـفـرَنْ طـرا

ذنــوبــي أثـقلت ظهرا　　　لنا اشـفـع يا رسـول الله

أغـثـنـا يا حـبـيـب الله !

بـذنـبـي صـرت محجوبا　　　لـسـهـم الـلوم منصوبا

ولـلأعــداء مــغـلـوبـا　　　لنا اشـفـع يا رسـول الله

أغـثـنـا يا حـبـيـب الله !

لَـذو الـقـول وذو النظم　　　عـظـيـم الـذنـب والإثم

كـثـيـر الـلـهـو والـجـرم　　　لنا اشـفـع يا رسـول الله

أغـثـنـا يا حـبـيـب الله !

صلاة الله ما حتّا حمام الروض أو غنى
على طه الذي هنا لنا اشفع يا رسول الله
أغثنا يا حبيب الله !
كذا تنزل على الآل مع الصحب بأثقال
جبال الأرض والمال لنا اشفع يا رسول الله
أغثنا يا حبيب الله !

---

(١) يا دورست ئەوە مرۆڤ دوعا ژ خودێ بکەت کو ئەو مەهدەرا پێغەمبەری ـ سلاڤ لێ بن ـ د دەر حەقا مرۆڤی دا قەبویل بکەت ، نەکو دوعایێ ژ پێغەمبەری ب خۆ بکەت کو ئەو مەهدەرێ بۆ مرۆڤی بکەت ، چونکی دوعاکرن عیبادەتە وعیبادەت بۆ خودێ ب تنێ یە ، هەر وەسا یا دورست نینە مرۆڤ ( ئستغاث ) ێ وداخوازا هەوارهاتنێ ژ پێغەمبەری ـ سلاڤ لێ بن بکەت .

(٢) د ڤێ پارچەیێ دا و د یا د دویڤ دا دا شاعر ئیشارەتێ ددەتە هندەك دەقێن ئایەت وحەدیسان وەکی حەدیسا نە دورست : ( لولاك لما خلقت الأفلاك ) ، وئأیەتا ( لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ) ( الحجر : ٧٢ ) وئایەتا : ( وَلَسَوْفَ يُعْطِيكَ رَبُّكَ فَتَرْضَى ) ( الضحى : ٥ ) وئایەتا ( أَلَمْ نَشْرَحْ لَكَ صَدْرَكَ ) ( الشرح : ١ ) کو هەمی د دەر حەقا پێغەمبەری دا ـ سلاڤ لێ بن ـ هاتینە .

(٣) پەیڤا ( مین ) رامانا وێ ( درەوە ) .

(٤) ل ڤێرێ لەنگی د کێشا شعرێ دا هەیە .

٢

# إني قد صادفت ظبيا

إني قد صادفت ظبيا      خدّه كالراح راح
قد سبا أكبادي سبيا      والقرار مني راح

صاد بالصاد فؤادي      ثم نادى جئ لنادي
واشربنْ كأس الرشاد      وليكنْ فيك فلاح

لحظه السفّاك يوما      قد رمى للبال سهما
عمّ للأحشاء غمّا      قال هذا هوْ الصلاح

خده الورديْ استنارا      أوقدت في القلب نارا
أخرجت منه اصطبارا      قال يأتيه انشراح

نرجس العين مدامي      منه سكري وغرامي
منه قد غاب منامي      كل يوم لي صياح

جبهة الخل استنارت      قد سبت عقلي وغارت
هكذا الخلان جارت      عنده قتلي مباح

قد بدت شمس محياه ورمتني النبلَ عيناه [1]
ثم داوى جرحي خدّاه هوْ طبيب وجراح

قدّه قدّ قدّ بالي لا يبالي كيف حالي
فهو سلطان الموالي كل ما شافه لاح

ليتني كنت مقيما عنده صرت خديما
أكنس باباً عظيما جاء لي منه النجاح

غاب من ذكراه عقلي غمزه يفتي لقتلي
ليته باشر غسلي بالشراب والصراح

وجهه كأس شرابي أبذل فيها شبابي
لا تلمني بالعتاب منه مسك الخلد فاح

خده ورد طري سنه در دري
عينه سر فري كل من لاقاه صاح

شعره كالليل داج جيده في البيض عاج
فهو للعشاق تاج ليلهم منه صباح

نطقه فيض وعذب قوله رمز وجذب
حاله نصح ودأب بالغداة والرواح

منبع الأسرار باله مخزن الألطاف حاله
حكمة الرحمن قاله فهو في الأوطان ساح

قلبه عرش الإله حبه ناهي المناهي
منقذ من في الملاهي فهو للدين سلاح

يصحب الناس جهارا يعطي للعقل خمارا
يترك الخلق حيارى ما لهم منه براح

منه نبراس القلوب موقد مطفئ العيوب
قد جنتها في الغيوب من ذنوب وجناح

رامت الأحباب بابه يعشق القلب جنابه
قبّلوا شوقاً ترابه نالوا وجداً بالمراح

كلهم بالعشق حازوا ما أرادوه وفازوا
عن معاصي الله جازوا صاروا كالماء القراح

راية منه كفتني صحبة منه نجتني
عن شؤون شغلتني عن حبيب ذي وشاح

أنت أستاذ فؤادي أنت شيخي ومرادي
أنت مصباح رشادي أنت مسك وتفاح

شيخنا عبد القدير [٢] مـرشـد القلب الكبير
نـيـر الـبـال الـضـريـر منه عنه الـريـن زاح

ملـجـأ الهادي الحـزيـن شـيـخ شـيـخـي المتيـن
قطب تاغي النورشين مـنـهـمـا للـروح راح

---

(١) ل ڤێرێ سستی د کێشێ دا هەیە .

(٢) مەبەست پێ شێخ عەبدلقادرێ هیزانیە ، وشێخێ شێخێ وی عـەبدررەحمانێ تاغیە ، وئەڤ هەردو شێخە ل دەسپێکێ مە داینە ناسین .

٣

# فسبحان الذي أبدى

فسبحان الذي أبدى حبيباً صادني عيني
بورديه وصاديه ونونيه كقوسين [1]
من القوسين سهمين رمى قلبي زارين
فنالاه وقالاه : أتيناك بأمرين
بصب الدمع من عين وشق البال شقين
فقال مرحباً لكُما على رأسي على عيني
فجالا فيه بالود ودلاه على الزين
تخلى عن مناهيه وعمّا هو من شين
فخاطبت له سرا : بماذا نلت هذين
وقبلُ كنت في إثر الهوى تسري برجلين ؟
أجاب : أن بصرت منه خدين منيرين
جننت ثم قيّدت بقيدٍ من عذارين
وقفت فيه حيرانا وأديت بشهرين
فلما أن أفقت غصت في بحرين نورين
فيؤتي فضله الله لمن شاء بلا مين
ويأبى الله إلا أن يتم نوره عين

حمـدت الله شـكـراً أن أصبـت منه نبلين
خـلعـت بـعـد من ميل هوى الكونـين لعلين
فإن تسأل عـن الظبي الذي أعطاني شنئين
فظبي من رسولانَ ومغشي الفيض في البَين
يـصـيـد كــل مـــن لاقـاه بالمسك وطرفين
يــصـيـر مـنـه مـجـنـونـاً ومـخمورا بكأسين
يـغـطـيـه ومَـن شـمـوا مـن الـخاء ودالـيـن
بـشـعـر يـشـبـه ياءً يــكــون بـيـن لاميـن
هـو الـراح هـو الـروح هو الهادي لكونـيـن
هــو الـسـاقـيـهِ لـلـخـلق بـدالٍ بـين يائين
فـلـمـا أن رأيـت الـنـور يجري منه كالعين
تـمـسـكت بـه والـدمـع يـجري مني نهرين
جـعــلـت لـفـداه النفس والأولاد كالدين
فــزد فـي عــمـره منا إلهي ضعف عمريـن
بـقـطـب الـعـارفين الـراقد المولـى بنورشين
يـفـيـض الـشـيـخ عبد القـادر النور بكفين
إذا مـا الـهـادي نال الـحــب والـود لبابين
يــفــوز إن أراد الله مــــســـعـــاه بـــداريـن

(١) مەبەست ب پەيڤا ( ورديـه ) هەردو ڕوییّـن وینـه ، و ب ( صاديـه ) هـەردو چاڤن ، و ب ( نونيه ) هەردو بروينه .

٤

# نور عيني نور عيني

نور عيني نور عيني قلّ وازداد الشؤون
تاخت بر دل لشكر غم ناكه سالار جنون
طاقتم طاق اولدى بن ده قالمدى صبر وسكون
عەقل ودين تە بر ب تالان جان ودل تە كر زەبوون

قد أسلي البال إن بانت علامات الوصال
كفت دل دور است اين خوش خامى مى بيزى خيال
ممكن أولماز كيم إيده سلطان وگدايه اتصال
تو بكە رەحمێ شەپالێ بەس ل من دل كە تو خوون

في مقاسات الهوى بت كئيباً باللوى
بس نبود اين داغ افرزودى بزان نار نوى
نولدى گر صور سن ديسن حالن ندر أى بى نوى
دا كو بێژم خانما من تە ل من دل كر دروون

لم يذق من خده الوردي كؤوساً من شراب
انكه از عشق خودا در دل نبود است التهاب
أويله أبله بيلمز اصلا قيمت خمر وكباب
تو ب مەى حەى كە خودايا ئەڤ دلێ ژار ونوگوون

قـد سـبـت سـلـمـى رشـيـق الـقـد عقلي باللحاظ
در پـيـش افـتـاد دل مـنـعـش نـكـرد پـنـد وعـاظ
هـر كـه مـشـتـاق أولـه عـشـقـى لـوميله أولر غلاظ
تو تەنىٚ فەرسۆدە [٢] دل مايى هەڤال بۆرين وچوون

كـلـمـا ازدادت هــوى بــالــي هــوانـــاً زاد لـــه
آرى يـك نـــون اســت فـــرق شـان بـــنـــزد عاقـلـه
مـجـنـون أولـور عـشـق هـجـوم ايـتـد كجه نفس كاملـه
هەر ئەزم مەقتوولىٚ وان چەشمىٚ دو صاد وبرە ونوون

كــن أديـــبـــاً هـاديـــاً لا تـــبـــغِ في الأرض الـفـسـاد
مـــثــل ســيــف الـديــن مـبـاش بى باك أز أهل رشاد
بــرگــون الـبـتـه بولور ظالم جزا سن چـوق شـــداد
هـادى مـونـقـادىٚ شـەهىٚ ثـانى [٣] ب شاهىٚ دەهنموون

---

(١) ئــەڤ شـعـرە ب چار زمانان هاتيە ڤەهاندن ، رێزا ئێكىٚ ژ هـەر چارينەيـەكىٚ ب عەرەبيـە ويـا دووىٚ ب فارسـيە وياسـيىٚ ب تركيـە ويـا چـارىٚ ب كورديـــە ، وئاشـكەرايە كو شـاعرى د ڤىٚ چـەندىٚ دا چاڤ ل شـاعرىٚ مـەزن ئەحمـــەدىٚ خانى كريە ، چونكى وى ژى شعرەكا ب ڤى ڕنگى هەيە .

(٢) فەرسۆدە ئانەكۆ خراب بووى ، فەرسۆدە دل يەعنى : دل خراب .

(٣) مەبەست پىٚ شێخ عەبدلقادرىٚ هيزانيە ، وشەهىٚ ئێكىٚ شـێخ صبغـەتوللاهىٚ هيزانيە ، ئەوىٚ ب ناسناڤىٚ ( غەوسىٚ هيزانىٚ ) دئێتە ناسين .

٥

# ب نامیزەد حەبیبا من

ب نامیزەد حەبیبا من
شەبیهی ماهێ کەنعانە
ب سەد سووگەند طەبیبا من
ژ بۆ دەردان چ لوقمانە [١]

عەلائوددینێ عەطارە
عوبەیدوللاهێ ئەحرارە
نوجووم وشەمس وئەقمارە
موضیئێ ئەرض وئەسمانە

ژ فەیضا سەرمەدی دلبەر
عەیان بوو سەرمەدی ئەطهەر
ب چاڤ دل سڕ مە دی ئەنوەر
دەما کو هاتی جەولانە

بــروو قــەوســە جەنان قودسە
ژ حالـێ کــەس تــو نـاپـرسـە
عوشاقان دکـوژە بێ بێ ترسە
ژ ئاە و زار و ئــەفـــغـانـــە

چ خوەش گولخەدد ونەیقەددە
چ جادۆچـەشـم ولـەبقـەنـدە
چ شـێــرین وشــەکـەرخـەندە
هــەزار وەك مــن ب قــوربانـە

ب ئــەڤ ڕەنــگ نـاز ودلـداری
ب ئـەڤ دیـهـیـمێ سەرداری [٢]
ب ئــەڤ روخـسارێ گـولـنـاری
حــەمــی تــە کـرنـە حەیرانە

ژ ســەر تـا پـا حـەمـی نووری
ژ بـوعـد و غـەفلەت ودووری
تـە نـابـیـنـن مـەگــەر صووری
ژ مــەعــنـا مانــە حـرمـانـە

وەرە ئــەی جان بـبــە عـاشق
ڤـەخــوە جـامـەك مـەیا رائق
د صوحبەت ڕوونـە دل صادق
بـبـیـن ئــەســـرارێ ڕەحمانـە

ئـەگـەر سـەد سـال تەقوا کەی
ژ عـشـقـێ ژی نـەبـت دل کەی
مـەسافـە نابـتـن قـەط طـەی
د تـیـهـێ دێ بـی عـەطـشانـە
نـزانـم هـۆڤـی یـا کـووڤـی
د دل ناچـیـنـی ڕاسـت تـۆڤـی
مـەبـە صووفیـیێ فەن ڕووڤـی
ب ڕاسـتـی گـاف دە مـەیـدانـە
ژ ڕۆژا حـوجـرە و مـەهـدێ
بـکـە جـەهـدێ حەتا لەحـدێ
مـەبـێـژە : سەبتێ یا لەحـدێ
طـەلـەب ڕا نـیـنـە پایانـە
ئـەگـەر سـەد سـال بکی طاعەت
تـەجـەلـلـی نایـتـە دل راحەت
د صوحبەت ڕوونە یەك ساعەت
تـەجـەللی بـیـتـە کاشانـە
قـەسـەم بـان لـەعلێ شێرینە
تـو پـیـرێ صوحـبـەتـێ نـیـنـە
ب مـثـلـی بـابـێ شـێـریـنـە
ضـیـابـەخـشـێ دل وجانـە

( تعالى الله ) چ سـولـطـانـى
چ خـوەش شاهـى چ خـوەش خانى
چ خوەش دەنگ و چ خوەش خوانى
مەلـەك رەقصى د کەیوانە [٣]

دو شـەمـس و دو هـلالـێ گـەش
ل سەر صوورەت چ خوەش بوون نەقش
ژ چاهـێ غـەبـغـەبا [٤] ڕوو بەخش
حـەیات دا جـوملـە ئـنسانە

حەچی کو شەه ئەوی مەی دا
نـهأیـەت بـوویـە ئـەو شـەیـدا
ژ یـومـن و هـمـمـەتا سـەیدا
چـراغ هـلکر د ئـەیـوانـە

ژ طـووری قەلبێ وەك شەمعە
ب سـیـنـە چـوو گها لەمعە
بوویە مەدهووش و بێ سەمعە
وەکـی مـووسا بـنـی عمرانە

چو قەصد دل کە ئەو نەخچیرە [٥]
ژ وان طاقـێ مـوقـەرنەس تیرە [٦]
وی باراند فـەیض کر تەئـثـیـرە
شـەبـیـهـی ئـەبرێ [٧] نیسانە

د ڤـی عــەصـری مـەبـە غافل
مــەبـۆریـن عومری بێ حاصل
ڤـەخـوە جامــەك مـەیا ناهل
ژ دەســتــێ پـیـرێ مـەیـخانە
هــەڕۆ مـــەی نـایــتـە بازارێ
ئــەگــەر نــەکڕی تو ڤێ جارێ
تـو نـابــیـــنـــی د دل نـارێ
ژ وی لـەعـلــێ بـــدەخـشانە (٨)
مــەیـا ئـەنـگـووری (٩) لەو نینە
شــەرابا وەحـــدەت و دیــنـــە
شــەهـ ئـانـی وی ژ نــوورشـیـنـە
گـهانـد پــێ جان ب جانـانـە
تـو شــەمـعـا جـەمعێ خوللانی
ب حـوسـنـێ ماهێ کەنعانـی (١٠)
تــو عـەبــدلـقـادرێ ثـانــی (١١)
ب تــە رووح هـات سـەیــرانـە
ب ( قـطــب العـارفـین ) تـاغی
بوو ( شمس الدین ) د ڤی باغی
مـوحـەمـمـەد هـادیـێ لاغـــی
نــەکـی مـەحـرووم ژ عرفانە

ئـەسـیــر و بــیٚ نـــەوا مـایـە
فـەقـیــر و مـــوبـتـــەلا مـایـە
مـــەریـــض و بـــیٚ دەوا مـایـە
مــەدەد کــە بــۆ وی دەرمـانـە

---

(١) سووگەند : سویند .

(٢) دیهیم : تاجا شاهانی .

(٣) کەیوان : ستێرا ( زوحەل ) .

(٤) چاه : بیر ، چال . غەبغەب : بن ئەرزنك .

(٥) نەخچیر : نێچیر .

(٦) موقەرنـەس : نەخشـەیەکێ جوانیـێ یـە ل گۆشـەیا بـانێ مـەزلا دیوانخانــەیێ دئێتە نەخشاندن .. وهێژای گۆتنێ یە کێشا ڤێ چارینەیێ یا ڕێککەفتی نینە د گەل چارینەیێن دی یێن شعرێ .

(٧) ئەبر : عەور ، ئەور .

(٨) بدەخشان : باژێڕەکێ ئەفغانستانێ یە ب لەعلان یێ ناڤدارە .

(٩) ئەنگوور : تریە ، مەیا ئەنگوو : ئەو مەیا ژ تری دئێتە چێکرن .

(١٠) ماهێ کەنعان : یوسسف پێغەمبەرە ـ سلاڤ لێ بن ـ .

(١١) عـەبدلقادرێ ثــانی ( یــێ دووێ ) : شــێخ عــەبدلقادرێ هیزانیــە ســەیدایێ شاعری ، و عەبدلقادرێ ئێکێ : شێخ عەبدلقادرێ گەیلانیە .

٦

# ئەڤ دلبەرا ڕوو ماهی

ئــەڤ دلــبــەرا ڕوو ماهی ب قـەوسێ خـوەیـێ هـلالـی

یــەك دو خـەدەنـگ [١] ل دل دا مەجرووح بوو و نـالـی

من گـۆ : تە تـیـر ل مـن دا ژ وان ئـەبـروو کـەمـانی

کــو گــەهـ ل مــن کــە تـیـرانــێ د خـــوە و د کـالـی

من گۆ : ژ زولفێ مشکین [٢] یەك مەرحەمەك ل دل کە

گـۆ : مــەرحــەمـا ژ مــسـکـە ژێ تـێ ضەرەر تەوالـی

من گۆ : ب حەققێ زولفەین پێل بۆسە دم دو لەعلەین

گـۆ : مـاهــێ صـەومـە بـۆسـە شـەرع نادیتن حەلالی !

مــن گــۆ : د شــەب سـەرایـێ دێ بـێمە خولوەتا خاص

نا مـەحـرەمـی گــۆ : نـابـە ، نـەظەر دی من جەمالـی

مــن گــۆ : ژ دەست فـیـراقـێ ئەز سینە چاك [٣] و دالم

گـۆ : چاکێ دل خـــوە ریـبـــە دال دالـە سـەر دەلالـی

مــن گــۆ : ئـــەزم بـــریـــنـدار هەم تهمە ئەی نکاری

گـۆ : دلـبـریـنـێ ئـاڤـێ نـابـــە ڤــەخـــۆ ژ زەلالـی

من گۆ : ژ چەشمێ جادۆ [٤] بەس بکوژە من فـەقـیـری
گــۆ : جادوان چ کـارە غــەیــر کــوشـتـن وقـتـالـی
مــن گـۆ : وەرە تـو ڕوونە سەر هەردو چەشم وچاڤان
گـۆ : ژ خار مــوژە دبینە جسمێ حـەریـر مــەلالـی
مــن گـــۆ : ئــەزم د ئـیـرۆ سائل ونـابـمـە مەنهوور
گـــۆ : دلــبـــەران و عـوشـشاق ناکەڤنە ڤی مـەقـالـی
مــن گـۆ : د کـەج غـەشـێ دا کوشتی تە من نەحیفی
گـۆ : سال کەج و ب غششە ئەڤ ظولە حوکمێ سـالـی
مــن گـۆ : شــەهـێ هەزانی من کوشت ب ئەڤ نشانی
گـۆ : شـاهــێ تـاغـی کوشتی وی ژی ب ئــەڤ مـثـالـی
هــەر چ مـن گۆ شەپالێ یەك یەك ئەوان وێ ڕەد کـر
ئــەڤ ڕەنـگـە شـەئنێ شاهان حوکمی دکن ل مـەوالـی
یا ڕەب چ بـێ وەفـانــە ئــەڤ دلــبــەرانـــێ جــادۆ
دکــوژن کــەفــەن ژی ناکن کوشتییێ خەط وخالـی
ئــەبـروو هــلالا ڕۆ ڕۆژ سیـنـە صـەدەف ددان دوڕ
شــەب زولفان گیسۆ عەنبەر کوشتم ب یەك خیـالـی
هــەر کــەس ب قــەدر وحـالە ئەز مام فەقیر و ژارە
بــەس کـە ل من دەلالــی ڤــێ غەدر و ڤی کـەلالـی
بــوو هــەڤــدە سال تــەمـامــە دکێشم ئەڤ مەلامـە
کـەفـتـم ژ قـەدد و قامە قەط من نــەدی کـەمـالـی

ئـالام و دەردێ ســەر مــن گــەر ســەر جـەمـەل با جانا
کـافــر دێ بـچـنـە جەننەت فەهم کە تو ئەڤ مـەئـالـی
یــەك سـال د صـوحبەتێ شاه یەك ساعەتەك خویا کر
ڕۆژا کـو وی نـــەبـیــنـم یـــەك سالــەکە ب جەلالـی
ئـمـداد کــە غــەوث وســەیـدا فـەریـادرەسی [5] ژ وانە
شـاهــێ هـــەزان ژی نـابــە دوور بـــە ژ وی مـــەجـالـی

---

(١) خەدەنگ : تیر .

(٢) زولفێ مشکین : زولفا بێهنا مسکێ ژێ دئێت .

(٣) سینە چاك : سنگ شەقبووی .

(٤) چەشمێ جادۆ : چاڤێ سحرکەر .

(٥) فەریادرەسی : هاریکاری وهەوارهاتن .

٧

# ئەڤ عومرێ گران مایە

ئــەڤ عــومــرێ گــران مایە ژ دەست چو ب نەزانی
ڕووزەردە ژ فرقەت هەمە وەك بەڕکێ خـەزانـی [١]
( یا لـیـتــنــي بالـوصـلـة ذا الـخـلّ جـرانـي )
ئــمــداد و مــەدەد قـوطـبــێ زەمان شاهـێ هەزانی !

با ئاه و فـغــان بــەس کــە شــەب و ڕۆژێ دنـالــم
مــەجــرووح و بــریــنــدارم نــەحیف شوبهی هلالم
قامەت چو [٢] ئەلیف بووم ژ غەمان شوبهەتی دالم
ئــمــداد و مــەدەد قـوطـبــێ زەمان شاهـێ هەزانی !

دووری ژ تــە حــەق مـەرگە [٣] ئەگەر ناڤی حەیاتە
خــوەش بــەختـی ئـەوە ڕۆژەکێ ئەو پێشدا گها تە
دوور مامــە تــەنــێ ئـەز ژ لەبێ شەهد و نەباتە [٤]
ئــمــداد و مــەدەد قـوطـبــێ زەمان شاهـێ هەزانی !

هــەشــت وەصــفــێ زەکاتخور د مە دا هاتنە ووجوودێ
هەشت جەننەتێ حوسنێ دا تە خوەش کریە قوعوودێ
حەقـقـێ خــوە دخــوازم ژ تــە ئـەی مەنبەعێ جوودێ
ئــمــداد و مــەدەد قـوطـبــێ زەمان شاهـێ هەزانی !

ئــيــرۆ تـــه ســمــاط كێشا ب هەر سوويی [٥] دياره
جوز مەن [٦] حەمی خوارن ژ وی ئەمرۆد وئەناره [٧]
دەر شــەوق وطـەرەب جـومـلـەئـێ ئـەيـيـام بـوهاره
ئــمــداد و مـەدەد قـوطـبـێ زەمان شاهـێ هەزانی !
ناچار وكــەلـــيــل مـامـه ژ دەســت نـەفسا رەزيـلـه
بــەد كـێــشــه خــوه قەط ناسپێره ژار ودەلـيـلـه
حـەقـــقـــه كــو د عـوقـبـا ببـتـن ژار و ذەلـيـلـه
ئــمــداد و مـەدەد قـوطـبـێ زەمان شاهـێ هەزانی !
زولـفـەينێ كو ل شەمسێ روخێ ته گرته سەحابـه
هــەر گــەه كــو صـەبـا لـێ ددتـــن ژێ دچی تـابـه
هــەر ڕۆژ ژ وی ســەد دل وجـان كـــريـــه كـەبـابـه
ئــمــداد و مـەدەد قـوطـبـێ زەمان شاهـێ هەزانی !
هــەر يـەك كـو د گــەل دۆستێ خوه دائم د وصـالـه
ئـــەو جـەنـنـەتـێ فـردەوســی ژ حـالـێ وی مثـالـه
مــەهــجــوورێ ژ يارێ خـوه وی دۆزەخ بـوويه حالـه
ئــمــداد و مـەدەد قـوطـبـێ زەمان شاهـێ هەزانی !
گــەر مــن هـەبـتـن سەد رح و سەد قالب و قەلبـه
ئــيــرۆ دێ فــدا كـەم ژ بــۆ ئـەو خـادمێ عوتـبـه
مــن بـيـنـه شـومـارێ تـو د ڕێــزا ســەگ و كـەلـبـه
ئــمــداد و مـەدەد قـوطـبـێ زەمان شاهـێ هەزانی !

خــوەش نــازکــی کــو یا کو ژ گـول قەط نە سرشتی
ئایـا مـــەلـــەکـــی یـا پـــەری یـا حـــوورا بــهــشــتـــی
هەردەم ب خەدەنگێ خوە من مەظلوومێ تە کوشتی
ئــمــداد و مـەدەد قـوطـبــێ زەمان شاهـێ هەزانی !
ئـــەز مـــوفـلــس و نـاچـار و بــریــنــدار و نـەزارم
دائــم ب شـــەب و ڕۆژێ ژ هـــەجـــــرا تـــە دزارم
هــەر چ کــو تــە نـاڤـێ مـن ئـەوی ئاڤێت و دکارم
ئــمــداد و مـەدەد قـوطـبــێ زەمان شاهـێ هەزانی !
ئــەو صوحبەتێ جان سۆزێ تە ئکسیرە ب سۆگەند
وی دا ب دل و جانـە هــەزار سوککەر و هەم قەند
ئــەو کــەس کـو نــەنـاسی تـە مەئالا ئەوە دەربەند
ئــمــداد و مـەدەد قـوطـبــێ زەمان شاهـێ هەزانی !
ئـەرکانـــێ دیـانــەت ب تـــە ئــیــرۆ بـوویــە مـوحـکەم
هەر کەس کو تە دی ئەو ب مەحەببەت بوویە مەعلەم
نابینە تـە هــەر کــەس تـویــی یەك کەنزێ موطەلسەم
ئــمــداد و مـەدەد قـوطـبــێ زەمان شاهـێ هەزانی !
یا رەبـبـی مـوئـەیــیــەد کـی تـو ڤـی شاهی ژ بۆ مە
کێـشـایـە ب چاڤان ژ مـەحـەببەت ئەوی سورمە (٨)
بــوو شــەمـــسـە د ئـیـسلامێ ب ڕۆژ و ب شەڤێ مە
ئــمــداد و مـەدەد قـوطـبــێ زەمان شاهـێ هەزانی !

ئــەڤ جـەوركــێ دەرگـاهــێ تـە هادی چ کەمینە

مـەئـوا و مــەلاذێ وی مـودام [٩] بـابــێ ئـەمـیـنـە

ئـیـرۆ تـو ب سـەیـدا کـی بـڕێژە فەیضـێ موبینە

ئــمـداد و مـەدەد قـوطـبـێ زەمان شاهـێ هەزانی !

---

(١) خەزانی : فەقیری و هەژاری .

(٢) چو : وەکی .

(٣) مەرگە : مرنە .

(٤) لەبێ شەهد و نەباتە : لێڤا هنگڤین وشەکر .

(٥) سماط : سفرە ، مێدەك . سوویی : لایی .

(٦) جوز مەن : ژبلی من .

(٧) ئەمرۆد : هرمیك ، عەرمووت ، ئەنار : هنار .

(٨) سورمە : کلێ چاڤان .

(٩) مودام : هەرگاڤ .

٨

## فەیض و کەرەما باری

فـەیــض و کــەرەمـا بـاری دبـاری ب کــەمـالــە
سـەیـدا ب جـەماله
دونـیـا ژ فـویـووضـاتـێ وی بـوو بـەحـر ونەواله
پورٍ جەذبە و حالە
وی فـانـیـێ مـوطـلـەق د ڤـی عـەصری تو بزانە
بێ شەكك وگومانە
عـالـەم ژ ئـەلـەم خـالـی بـوو بـوو گولشەن و لالە
عـاشـق د وصــالــە
خـوەش پـیـرێ خەراباتە خودا کر وی هوەیدا [١]
روحـم فـدا سـەیـدا
نـوطـقـا وی ژ بـۆ عــامــی دبـی عـەیـنـێ زەلالـە
یا سـحـرێ حــەلالـە
زولفەینێ مـوعـەنبەر کو ل دۆر خەددی خویایـە
قـانـــوون وشــفـایــە
دەرمان و دەوایــە ژ بـــۆ ئــەمـــراض و مــەلالـە
دەفع کر وی کەلالـە

جـەنــنــاتــێ نــەعــیــم بـەحـث کو ژ وی تـێ ب دەوامـە

مـەطلووبێ عەوامە

ئــەو عـاشـقـێ شــووریــدە [٢] مــەرام وی خــەط وخـالــە

هـەم زولـفـێ دەلالـە

خوەش خۆیی چ خوەش گۆیی چ خوەش بوویی [٣] تو سەیدا

عـالـەم ژ تە شەیدا

صـوحـبـەت کـو دکـی ب ساز و دەف و نــەی و قــەوالــە

دل سەرخوەش ولالە

عــشــقـا تـــە غـــــەدارە دل و جـان بـــوو ژ وی ئـارە

سـوهـتـن ژ وی نـارە

گـیـسـۆیـێ مـوعــەطـطــر کـو صـەبـا لـێ بـوو حەواله

دا دل وی جــەلالــە

ســەیــدا کـــو ســـەرا پـایــی بــوویــە مـەظهەرێ نوورە

هەر دل ژ وی طوورە

حــوبــا وی ل دۆر شـــەمــســێ دلــی بــوویـە چ هالە

ڕێـتـی ل وی ژالـە [٤]

( والله ) د ڤــی عـــەصــــری وەکـــی شاهــێ مـە تاغی

نـابــت د ڤــی بـاغــی

هــەر کــەســێ کــو ژ دەستـێ وی ڤـەخوار جامەکێ ئاله

نـاپـوخـتـە [٥] و کاله

مشکین کره نوورشین کو ژ وی ڕەشکێ دکت چین
خوەش بابێ ضیادین
( والــريـــن عـــن الــقـــلـــب أذاب و أزال
والـحـب بـــدا لـه )
ئـــەو قـولـزەمێ نەخخارە هەزار یەممێ جەواهر
بـوویـە ژ وی ظاهر
ئـیسلام ب وی گـەش بوو و نـەما فسق و ضەلالە
قـەلب گرتی صقالە
قـەوسەینێ ل سەر شەمس و قـەمەر کریە قرانـە
فـەیض ڕێتە جهانـە
قــەیدکــریــە د بـەنـدێ دا ئەگەر ڕۆستەمێ زالە
ئـەو زولفێ ڕوو مالە
هــەر ڕۆژ ب تــەخـیـیـل هـەزار بـۆس وکـەنـارە
دل ســـەنـدێ ژیـارە
لــەو مـەشقێ مەحەببەت ژ بۆ دل خاء و دو دالە
یا قـاف و دو دالـە (٦)
ســەیــدا تــو کـەرەمـکە وەرە پێش شاهێ جهانی
هەم قوطبــێ زەمانی
لـوطـفـا خــوە بـرێــژە کـو جهان وەهم وخەیالـە
هـەم جـورم و وەبالـە

( قـطــب العارفـيـن ) ى تــو د نــوورشـين دا نشينى
نــســبــەت دەرەشــيــنى
هــەر گــﻫ ب جــەمـالــێ ژ تـــە نـادر تــێ جـەلالـە
خوەش خولق وخصاله
گــەيـلانــيــێ ثـانــى ژ تـــە ڕا دۆســـت ومـوعـيـنـە
با عـــەقــلــێ رەزينـە
هەر گﻫ كو شەبەيخوونێ (٧) دكه بەر سەهل و جباله
مـانــەنــدێ جـبـالــە
دەر دائــرەئـــێ عـــشــقــێ تـويى مەركەز و عومدە
هەر دل ب تە قەصدە
مــەعـنـا تـــە مــوعــەمـمـايـە نە مەعقوولێ ب قاله
دەركا تــە مــەحـالـە
ئـــەڤ بـــەيـــع و شـــرايا تـە د عـشقێ چ ب جايە
مــەحـضـا ژ خــودايــە
هـــەر كـــەس كـو شـــەمــالا تە وى دى بوويە هلالـە
پــەروانـــە مــثـالــە
عـالـەم حـەمـى يـەك جسـم و د وێ تو وەكى رووحى
يـا شـوبـهـەتـى يووحى
هـەر دل ژ تـــە مـــەجـــرووح و ژ عـشـقـا تە دناله
مـانـــەنــدى بــلالـــە

سەیدا کو ب وێ عالەمێ بەرزەخ کری هجرەت
غەرق بوو د شەهادەت
ئێرۆ مە تەسەللی ب ضیادینێ دەلالە
پوڕ نوور و شەماله
ئەو نسبەت و فەیضا کو ئیلاهی تە ل سەیدا
دیتی بوو ژ غەیدا
ئیرۆ ب ضیادین دە ب تەکمیل و کەماله
صوحبەت کە ب حاله
مانەندی موحەممەد تو نەکەس موفلس و ناچار
ئەفغان دکە هەر جار
خوەش جەورەکێ خالێ دشیرینە ب جەزاله
( الله جزا له )

---

(١) هوەیدا : پەیدا ، ئاشکەرا .
(٢) شووریدە : مسکین ، ترسناك ، هژهژۆك .
(٣) خوەش خۆیی : تبیعەت خۆشی ، خوەش گۆیی : گۆتن خوەشی ، خوەش بوویی : بێهن خوەشی .
(٤) ژاله : خوناڤ .
(٥) ناپوختە : خاڤ ، بێ سەربۆڕ وکێم تەجروبە .
(٦) خاء و دو دال ( خدّ ) ە ئانەکۆ : ڕوی ، و قاف و دو دال ( قدّ ) ە ئانەکۆ بەژن .
(٧) شەبەیخوون : هێرش .

٩

# ژ حەسرەت ئەز دبێم دائم

ژ حەسرەت ئەز دبێم دائم     تو نوورا چاڤ و هەم جانی
ژ غەفلەت ئەز هەمە نائم     مەدەد گەیلانییێ ثانی !

گونەهکارم برینـدارم     ژ دەستێ نەفسێ بێزارم
فەقیر حالم نیازدارم [١]     مەدەد گەیلانییێ ثانی !

ئەسیرم موفلسم بێ کەس     دسۆژم ئەز وەکی قوقنەس [٢]
ئەزم خاشاك و خار وخەس     مەدەد گەیلانییێ ثانی !

ئەز ناچیز [٣] و هەم لا شەی     مەنازل نابتن قەط طەی
حەزینم ئەبکەمم هەم عەی     مەدەد گەیلانییێ ثانی !

ژ شەوقا قامەتا عەرعەر     دل وجان من بوویە کەرکەر
نەباتی شەهد و هەم شەککەر     مەدەد گەیلانییێ ثانی !

وەرە جارەك ب مەردانە     کو شا کە بابێ مەیخانە
تو مەی دە جوملە رندانە     مەدەد گەیلانییێ ثانی !

چو گەستم وان دو شەهماران　　　بــريـــنــدارم گــەلــى ياران
دبـارن ئــەشــك [٣] وەك باران　　　مــەدەد گــەيلانـيـێ ثـانــى !

وەكى مورغێ سەحەر هەرگەه　　　دنـالــم ئـــەز ل بـــەر دەرگـەه
حــەتـا كو بـێـتـە من مەرگەه　　　مــەدەد گــەيـــلانـيـێ ثـانــى !

د خــەونــا دايــێ گــەيــلانــە　　　دگــۆ ب نـاڤـێ مـن ناڤ دانـە
ل وى حــەمــلا خــوەيا خانـە　　　مــەدەد گــەيلانـيـێ ثـانــى !

وەكــى نــاڤــێ تــە وى دانـــى　　　دبـى ئـەلـبـەتـتـە رەببانـى
دبێم ئـەز لەو غەزەل خوانى　　　مــەدەد گــەيلانـيـێ ثـانــى !

چ شـــۆخ و شــەنگ و دلدارە　　　ژ دل ئاڤـێـتــى ئــەغــيـــارە
د دل دا ڕاكـــــــرى نـــــارە　　　مــەدەد گــەيلانـيـێ ثـانــى !

دنـالــم ئـــەز شـــەب و ڕۆژە　　　ب پـــێــت و ئاگــر و ســۆزە
دبــێــژم ئــەز ب دەريـۆزە [٥]　　　مــەدەد گــەيلانـيـێ ثـانــى !

هەمى ئەصحاب سەفەر كێشا　　　د گــەل ئـەحـبـاب و دەروێشا
تــنـــێ دوور مـامــە ئەز ئێشا　　　مــەدەد گــەيلانـيـێ ثـانــى !

ل دەرگـاهــێ تـەمـە چاكر [٦]　　　وەكــى كـو مـن ل وى چا كر
جــەوارح جوملە بوون شاكر　　　مــەدەد گــەيلانـيـێ ثـانــى !

تە زاغان ئیرۆ چین چین کر　　　منێ مسکین تە پێ دین کر
ب وی تەقوییەتا دین کر　　　مەدەد گەیلانیێ ثانی !

خودێ دایە تە ئەڤ روتبە　　　ئەزم قطمیرێ ئەڤ عوتبە
دکم ئەفغان وەکی کەلبە　　　مەدەد گەیلانیێ ثانی !

هەزان دا ئیرۆ تو شاهی　　　ژ بۆ ئیسلامێ تو راهی
ب تە چێبوونە گومراهی [٧]　　　مەدەد گەیلانیێ ثانی !

ل سەر سەطحێ خەرابا تە　　　درێژی هەر فویووضاتە
تە دل کر غەصب و غاراتە　　　مەدەد گەیلانیێ ثانی !

ب حەققێ سررێ سەیدا کی　　　ب حەققێ غەوثێ غەیدا کی
ب راحەك رووحێ من شا کی　　　مەدەد گەیلانیێ ثانی !

نەما من صەبر و تەمکینە　　　ژ شەوقا بابێ شێرینە
هەوار بابێ ضیادینە !　　　مەدەد گەیلانیێ ثانی !

تویی دلدار و هەم دلبەر　　　تویی هەم زەمزەم و کەوثەر
تویی سەردار و هەم سەروەر　　　مەدەد گەیلانیێ ثانی !

ب حەققێ مەرقەدا سەیدا　　　نەکی ناسی منێ شەیدا
وەکی سەیدا ب تە مەی دا　　　مەدەد گەیلانیێ ثانی !

چ ســەرحەد ئیرۆ تە قەصدە تــە شــادی بــر دودا وەر دە
ژ نــووڤــە دێ بــریــن سەردە مــەدەد گــەیـلانـیـێ ثـانــی !

د خـاکــێ دەرگــە ڕوو مـالـم ژ دەردێ فـرقــەتــێ دالـــم
ژ بــێ حـالـی چ خوەش حالم مــەدەد گــەیـلانـیـێ ثـانــی !

موحەمـمـەد هـاتـی بـەر بابە ڤـەخـوە دا ئــەو مەیا نابە [8]
کـو شەش پەردە دو جار نابە مــەدەد گــەیـلانـیـێ ثـانــی !

---

(١) نیازدار : هەوجە .
(٢) قوقنەس ( قوقنوس ) : طەیرەکێ خورافیە ، دبێژن : پشتی ب ئاگری دئێتــە سۆتن خولیا وی جارەکا دی خۆ لێك ددەتەڤە ودبتە طەیرەکێ دورست !
(٣) ناچیز : چونە ، بێ خێر ، بێ بها .
(٤) ئەشك : ڕۆندك ، هێسترِ .
(٥) ب دەریۆزە : ب خوازۆکی ، ب گەدایی .
(٦) چاکر : خولام ، خزمەتکار .
(٧) گومراهی : سەرداچووی .
(٨) ناب : خوڕی ، پاقژ وصافی .

١٠

## مەحوا جەسەد کە

مەحوا جەسەد کە      ئحیا کەبەد کە
شەیطانی طەرد کە      شەیخم مەدەد کە

مەعشووقە دلبەر      هەر عشقە رەهبەر
جیگەر مە کەرکەر      شەیخم مەدەد کە

ئەز هەمە غافل      بێ عەقل و باقل
نادان و جاهل      شەیخم مەدەد کە

ئەز بێ بەصەرم      هەم بێ خەبەرم
ژ گوه ژی کەڕم      شەیخم مەدەد کە

تو شەیخێ ئەکبەر      ئەز عەبدێ ئەفقەر
موفلس و ئەحقەر      شەیخم مەدەد کە

ئەز بوومە بێ هەش      پەرموژدە دلڕەش
ناچار و نەخوەش      شەیخم مەدەد کە

فـەیـضـا خـودایە          نــك تــە خــویـایـە
مــن كـــە دەوایـــە          شـەیـخـم مـەدەد كـە

صـــەررافـــێ جـانـی          ددی مـــە جــانـــی
خــەمـــرا جـنـانـی          شـەیـخـم مـەدەد كـە

مـن چـو ژ دەسـتــە          عـومـرێ خوە جوستە
ئـومـێـد كو سوستە [١]          شـەیـخـم مـەدەد كـە

( قـــد مـــرّ عـمـري          وابـــیـــضّ شـعـــري
فـاخـــتـــل أمـــري )          شـەیـخـم مـەدەد كـە

ئــەز هـاتـمـە دەرگـاه          با ئـەشـك و سەد ئاه
ئــەز بـوومە گومراه          شـەیـخـم مـەدەد كـە

مـــــن پـــورە ئـالام          كـەشـیـــرە ئــەسقام
وەفـــــیـــــرە ئـاشـام          شـەیـخـم مـەدەد كـە

حـوبـبـا تــە رووحـە          لاح و صـــەبـــووحـە
دل پـــێ فــوتـووحـە          شـەیـخـم مـەدەد كـە

دل كـــر تـــە تـــالان          جـوویـــێ رەسـوولان
ئــەز مـــامــە نـــالان          شـەیـخـم مـەدەد كـە

هـادی نـــه تـــشـتـه          وی فـعــلـێ زشته [٢]
بـــریـــن گـــهـشتــه          شـەیـخم مــەدەد کـه

(١) سوست : لاواز .
(٢) زشت : کرێت ، خراب .

۱۱

## یارم بقصد کوشتنم

یارم بقصد کوشتنم　　امروز در رفتار شد
چشمم برای شستنم　　چون چشمهء کهسار شد

یك روز ترکم کج گلاه　　شبدیر زاند در شاه راه
دیدم چو آن رخسار ماه　　غمگین دلم بیمار شد

د دره چو أین عشوه نمود　　دل را ژ من آسان ربود
هر جا که جلوه کرده بود　　زان جا هزار بیکا رشد

آن ترك عاشق کس نکر　　هرجا کرفت بی جنك وزر
أین رستم وآیین بشر　　از حکمت جبار شد

از نرکس مستانه اش　　کر خویش وکر بیکانداش
مستند در کاشانه اش　　این طرفه دل هشیار شد

کو از کریبان سربر ار　　بر عاشقان شب کن نهار
تا نور کیرد هر دیار　　کوسه کجا این کا رشد

سیار شمس خاوری — با آن لباس داوری
کرد هرجا چون پری — هر کس که دیدش یارشد

در چاه سیب غبغبش — دل تشنهء لعل لبش
پیرا منش زلف شبش — بکرفت چون گلزار شد

آن کیمیای همتش — عاقل بداند قیمتش
در صحبت چون جنتش — مسهای دل زروار شد

هر جا که آن سلطان دین — بنشست کشت صحرای چین
دلها ز عطر عنبرین — چون طبلهء عطار شد

بس کن شها جور وجفا — بکشاد در لطف و وفا
دل را جلاده از صفا — ور نه دلم بیزار شد

آیم بجست وجوی تو — چشمم براه کوی تو
چون من ندیدم روی تو — دل را فغان از کار شد

هادی بدربانی تو — نی نی بسکانی تو
آمد بقربانی تو — دلدار نا دلدار شد

با شاه نورشین پوست نشین — عبد القدیر کشت همنشین
اسرار رب العالمین — از قلب او انهار شد

١٢

# عاشق كو هەبە مەظهەره

عاشق كو هەبە مەظهەره بۆ جەور و جەفائێ
هەم مەخزەنێ ئەكدار و غەم و دەرد و بەلائێ
سەرجوون دبێن خەطوەيا ئەووەل د وەفائێ
هەر سوختە دبت باكر سەد نەوعێ عەنائێ
دا پشتی فەنا بوعدێ بەقا بێتە لقائێ

حەيرەت بدە بەندێ خوە ب ئفراطێ مەحەببەت
رەحمێ كە ل قەلبێ كو دسۆژت ژ مەوەددەت
مننەت بكە جارەك ڤەكە بەرقەع تو ژ طەلعەت
مەحظووظ ببە تابەندە [1] ژ روخسارى ب روئيەت
ما دێ چ ببت گەر ڤەكى بەرقەع ژ سەمائێ

دلبەر ب هەزار جلوەء و سەد ناز و كرشمە [2]
جارەك ل عوشاقێ خوە تەجەللى دكە دێمە
ئەو مەحوە دبن ژ روئيەتا وى عارضێ سيمە
خالى دكرن ئەو حەمى فعلێ د ذەميمە
خوەش دەولەتە گەر دييەسە يەك عەبدێ فەنائێ

ئـەڤ درهـەم و دیـنـار و حـەمـی مـالـێ مـوقـەنـطـەر
ئەڤ مەنصب وئەڤ جاه و وە ڕەنگ لبسێ موعەططەر
ئـەڤ دلـبـەر و رەعـنـا كـو شـەبـان مـوئـنـسە دەر بەر
غـافـل كـرنـــە قـــەلــب و دلان گــوهـ ژی كـــرن كـەڕ
یـا رەب تـــو مـــەدەد كـــە ژ بـــۆ ڤـــی دەرد ودەوائی

ئــەڤ نـەفـس و هـەوا دونـیـا و شەیطان كو چارن
قـوطـطـاعـێ طـەریـقـن ژ مـــە ڕا شوبهەتی مارن
هـــەر چـــی كـو ل دوو وان بـچـتن شوبهی دەوارن
گـەر مـیـر و مـــەلا شـاهـ و گـەدا بـن حەمی خارن
دەر صـوورەتـێ ظـاهـر حـەمـی یەك ڕەنگ نومائی

جـارەك تــو وەرە بـال و پـەڕان خـوەش بـوەشـیـنـە
ژ ئـەڤ كـاخـێ دنـێ (٣) سـەیر كە ب فردەوسا بەرینە
بـمـرە كـو تو هێژ نەمری (٤) ب حوبب و ب ئەڤینە
ئــمـداد و مــەدەد قـوطـبـێ هـەزان بێژ ب ئـەنینە
دا پـــەنـــج لـەطـائـف حــەمــی سـەیركن ب سەمائێ

ژ ئـیـمـانـێ یە حوببێ وەطەن (٥) ئەی عارفێ ئەخبار
نـێ شـام و عـــراقـــە وەطـەن ئەی مەخزەنێ ئەسرار
سەردەست ل عەرشێ عالەمێ رووحە وەطەن ئەی یار
ئــرسـال ب وەطـەن پـــەنـــج لـەطائف كە تو یەك یار
دەر صـوحـبـەتـێ وی دلـبـەرێ مــەحـبـووبێ خودائی

تـا نــەفـسـا خـەبـيـث نـەئـێـتە ئطاعـێ ب نەزارى
ئـەعــمـالـێ د ظاهـر حـەمـى خامــن ڕيا كارى
سوهـتـن ژ مەحەببەت د ڤێ وەك عوود و قومارى
تـا نــەفــس بـبـت نـاجـى و هـەم عارى ژ عـارى
هــەر ظللا د پــێــڕە دكــوژت نـەفـس گـەدائى

عـامـىيـێ ( كـالأنـعـام ) چ دزانـت حـەقـێ صوحبەت
هەر چ كو ژ صوحبەت كرى فەهم كريە وى خدمەت
بـا مـال و بــەدەن دەفـع وى كـر شوهرەت و رەغبەت
مــەئـيووس ژ حەمى خەلقێ جهان بوويە ب هممەت
ئــەڤ ڕەنــگــە ب عـشـقـێ دچـتـن ( ئەو ) ل بەقائێ

رەحـمـا تــە خـودايـا ل وى عــەبــدى بـە هەزار جار
زانــى كــو چ مــقـــداره ژ حــەددێ خوه نەبوو مار
تـاجــێ تـوژ د ڤى عەصرێ خەراب كرنە ب يەك جار
قــەلــب و دلـێ ڤان جاهلـێ مـەجـرووحـێ بريندار
يـا رەبـبـى ژ تــاجـــێ تــوژ بــده خـەلقـى رەهـائـێ

ئـبـلـيـســێ كــو نــە ڕێ ل عــەوامـانـێ فەقـيـر حال
هــەر يـەك دبێژت : ( مرشد باللّه ) يـمــە نـيـنم مال
لــەو ( مــرشــد باللّه ) ى و مـەلـبـەس ثەوبەكێ مال
دەر صوورەتێ ظـاهر حەمى يەك ڕەنگەش ويەك ڤال
لـــەو هـادى و ضـال قەط نەبوو وان فەرق و جودائى

مورشد ئەوە کو ژ صوحبەتا وی جەمعێ دلان بت
ژ ئـەوصـافـێ ب سـەر خالێ بتن شوبهی گولان بت
مـەشـرەب مەلەکی بن ژ بوزورگان و کەلان [٦] بت
هەر صافی وصادق بە نە عەقرەب نە یلان [٧] بت
ئـەڤ مـورشـدە لائـق ژ بـۆ هـەر مەدح و ثەنائێ

هـادی ب مـثـل شـاهـێ هـەزان قـوطب تو نینە
هـەر چ ژ دلان کـۆرە وی نـابـیـن ونـەڤـیـنـە
بـا طـەیـلـەس و بـا مـروەح و بـا تـاج کو نینە
نـك ئـەهـلـێ صـوەر نـابـە حەبیب بابێ شرینە
یـا رەبـبـی ژ ڤـان دلان ڕاکـە عـەمـائـێ

(١) تابەندە : خودان گەشاتی ، بریسقەدار .
(٢) کرشمە : نازکی ، ب غونجە .
(٣) کاخێ دنێ : قەسرا دنیایێ .
(٤) ئـەڤ ئیشارەتە بـۆ وێ گۆتنـا صووفی دبێـژن : ﴿ موتـوا قبـل أن تموتـوا ﴾ وهندەك ب خەلەتی ڤە هزر دکەن ئەو حەدیسە .
(٥) گۆتنا ﴿ حب الوطن من الإيمان ﴾ ئەوا هندەك هزر دکەن حەدیسـە ، ب چـو ڕێکێن دورست ژ پێغەمبەری ـ سلاڤ لێ بن ـ نەهاتیە ڤەگوهاستن ـ .
(٦) بوزورگ ، کەلان : مەزن ، سەرۆك .
(٧) یلان ، ئیلان : ترکیە ئانەکۆ مار .

١٣

# ئەڤ چ دارە چ دیارە

ئـەڤ چ دارە چ دیـارە كــو حــەمـی گـولـشـەن وباغە
دلـێ مــن ژ فـرقــەتـا وی بــوویــە بــریـــــن و داغە
جهێ عوششاقێ خودایە كو حەمی مەحرەمسەرن [١]
هــەر چ دامـانــێ د وان گــرتــی وی دل بـوویە ساغە
شـاهـد و سـاقـی و مـوطـرب كـو ل وی جـەمـع دبن
ژ خــوەش صـوحـبـەتـێ یەك سالێ د وان یەك چاغە
جـانـفـدا خــدمــەتــێ جـانـان دكــە وەك پـەروانــە
هــەر چ كـو ژ عشقێ گها لـەذذەت و ذەوقێ ب دماغە
هـەر چ كـو بــهــن كـی خوەش بهن كریە ببینی خوە
خـادم و زائــرێ وی مـــــەرقـــــەدێ شـاهــێ تـاغـە [٢]
بــوویــە دەمـسـازێ د نێڤ رەوضـەئێ قوطبــێ تاغی
هــەر یــەك بـولـبول صفەتە نیك طەبیعەت [٣] زاغە
كــریــە ئـــقـــرار ب قـوطـبـیـنـیـا شـاه شـاه و گەدا
هـــەر چ ئـــەو ڕەنـــگ ددیــت چاڤێ د وی مـا زاغە
دەم مـەسـیـحـە شـەهـێ من حەی كری قەلبێ د مری
بــوویــە مــەمـلووء ژ فویووضاتێ وی سەهل و داغە

چ کـو مـەصبـووغ بوویه ب ( صبغه الله ) لەو بوویه

جـوملـه ئـــەتـبـاعـێ د وی ژ دیــنـێ موبین ڕا ماغه

وی چ خـوەش تـەحـلیـەکر قـەصـرا دل و هەم دینه

ب مـوصـەنـدر ب نـوقـووش و ب رەف و هـەم جـاغـه

هــەر کــه ثـابــت قــەدەمــه ئەو د ڕیا دۆستی بزان

واصــلــه هـــەر کـــه ب هـــەر بـا بـچـتـن ئـەو لاغه

تــو ب خـــوه دبـیـنـی مـــەبــه غـافل جانانێ جانـم

خـــود نـــومـــا هــەر کە هەیه شوبهی حوباب و ماغه

شـــاهـــێ نـــوورشـیـنـی مورەصەع کری رووح وجانه

هـــەر کــه تــەسـلیم نەکری دل بوویی ئەو وەك ناغه

خوزیێیا من ب وی عەبدێ کو ل نك شاهێ خوه ڕوونه

ڤـــەخـــوه شـیـــرێ دو ثـــەدیـان و بـکـەت پـوڕ کاغه

صـوحـبــەتـا شـاهــێ بـوخارا تو د نوورسینێ ببین [٤]

مــەبــه وەك مــشـکــێ د مـشـکـانــێ سـەفـیـه و کـاغـه

تـــو ب حـوبـا شەهێ نوورشین بکه حەی قەلبێ مری

دا کــو مـــەحـکەم بــبــه دل شـــوبـــهی بویووتێ ساغه

هــادیـــێ نـــامـــه ســـیــاه مـایـه وەحید و بێ کەس

مــــەدەد فـــەیـــض و کــــەرەم خـوەسـتـی ژ شاهێ تاغه

---

(١) مەحرەم سەر : مەحرەم سەرا ، لایێ کەسێن مـەحرەم ( خویانی ) ژ کۆچك وسەرایێ .

(٢) مەخسەد پێ شێخ عەبدررەحمانێ تاغیە .

(٣) نیك طەبیعەت : تبیعەت جوان وباش .

(٤) شاهێ بوخارا شـاه محەمـەدێ نەقشـبەندیە دانـەرێ طـەریقا نەقشـبەندی ، و نوورشین ئەو جهە یێ شێخ عەبدررەحمانێ تاغی یێ نەقشبەندی لێ .

١٤

# ئەو دلبەرا قەوس ئەبروو

ئـەو دلـبـەرا قـەوس ئەبروو     وەصـلا خـوە مـە مـزگـين دا
ئـەو طـلـعـەتـێ ماه و ڕوو     جامـەك ب مـــە شـريـــن دا

ئـەو وەعــدا بــەر و طاقان     بـوو مـوطـرب و عـوشـشاقان
ئـەو شـاهــن و هـەم خاقان     وەصـلـێ كـو ب تـەعـيـين دا

هــەر چــەنــد فـراق طالـە     هــەر ڕۆژەكــێ يــەك سالـە
تــەسـلـيــم بـە مەكە نالـە     دلــبــەر وی وە تـەحـسـيـن دا

مـەجنـوون بوويە هەم شەيدا     وەك وامــقــە (١) پـوڕ سـەودا
هـــەر چ كـــو د عـشـقـێ دا     دەرســـەك د وی تــەلـقـين دا

غـائــب كـو ژ نـاســووتـــە     ڕوو ڕەنـــگ ژ لاهـــووتـــە
وەك مـورغـەك جـەبەرووتـە     هــەر گــاڤــەكـێ تەلوين دا

يەك جاركی خەف چووم ئەز     لــەعـلــەيـنـێ بـبـووسـم ئەز
لـەعـلـەيـنـێ نـەبووسام ئەز     تـــەكـــديـــرەكـی ڕەنگين دا

زولـفـەیـنـێ ل سـەر خەددەین		وەك هالەكێ ل دۆر شەمسەین
قـەوسـەیـنـێ ل سەر طەرفەین		خـوەش طـەرفەكی تەمكین دا

زولـفـێ وێ ثـــوعــبـــانـــە		گـــەســتــی دل و هـەم جانـە
ئـــەز مــامـــە ب حــەیــرانـە		عـــەقـــرەب كو ل پەروین دا

هــەر چـەنـدە ئـەزم رەنجوور		ئــەو دلــبـــەرا سیـرەت حوور
مـن دیت و ژ غەم بووم دوور		لــەمـعـــێ كــو ل بـالـــیــن دا

دنـــدان دوڕ و لـــەب لـەعلـە		مـــن چاڤ ژ بــۆ وێ نەعلە
كــو بـــیـــكـــە نـەبێ تـەعلە		كـــەر مــەشكێ د سەنگین دا

ئـــەو نـازكا ســـیـــم دێـمــە		ڕۆژا وەكـــو ئـــەز دێـــمــە
بـــووم دیـــنـــەكێ بێ بێمە		وەك بــیــمــە د لـــەرزیـن دا

وەك كـەبـكـێ دورێ ئەو یار		رەفــتــار كـــری یــەك جار
جـان و جـگـەرێـم كـر نار		مـــن د ڕێ دا دل و دیـــن دا

ئـــەو مـــەعــدەنـێ ئەسرارە		هــەم قـولـزوم و ذەخـخارە
هــەر كـەس ژ وی نەضـارە		وی حـصـصـە مـن نالین دا

ئـەو ڕۆژ لــەو ل جـەوزایــە		بــەرقـــەك ل لـــجـێ دایـە
هــەر كــەس ژ وی سـەودایـە		ئـــەز مـــامـــە د نـــفــریـن دا

رۆژ کو بچتن سەرەطان      هیڤی مە هەیە ژ رەحمان
کو ئەم بچین نك سولطان      سولطان ب خوە تەئذین دا

بەرقەع کو ژ بەر طلعەت      ڕاکر ل مە بوو جەننەت
مەجنوون کر و وەهم بەست      دەر کاکولێ پەرچین دا

ئەو حووری‌یا مینوویە [٢]      مەنظەر وێ وەکی ڕۆیە [٣]
ئەو نازك و خوەش خۆیە      تیرەك ل منێ دین دا

بوو دلبەر و هەم دلدار      هەر چ ژ وی بوو هشیار
ئەو عارفە ( ذو الأفكار )      کۆر مایە د تەخمین دا

ئەو شەهـ ژ ڕەسوولانە      دل بر وی ب تالانە
ئەز مامە ب نالانە      د فرقەتا خوونین [٤] دا

ئەڤ فەیض و فوتوحا تام      ئەڤ نسبەت و ئەڤ ئنعام
ئەڤ خەمر و صوبووحا جام      نور کر وی د نوورشین دا

خۆدبین نە خودابینە      هەر چەندە کو مسکینە
مەعنا ژ مەجازینە      ئەو ضالە د خۆدبین دا

(فالله هو الهادي      والمرشد صيادي
والذلة معتادي )      فانینە خودابین دا

هـــادی ل دوو دەرگـــاهـــان		بـــکـــشـــیـــنـــە ژ دل ئاهان
طـــطـــبـــەکە ژ وان شاهان		راحـــەك ب مـــە نـــووشین دا

---

(١) وامق : ناڤێ عاشقەکێ ناڤدارە ، ئەڤینداری عەذراییّ بوو .

(٢) مینو : بەحەشت ، عەسمان .

(٣) وەکی ڕۆیە : وەکی ڕۆژێ یە .

(٤) خوونین : خوینەلۆ .

15

# من ( تعالى الله ) دگۆتى

من ( تعالى الله ) دگۆتى ، چۆن ب مەش هات ئەو جەناب

كاكولىٚ مـشكـيـن ل سـەر بەدرىٚ بەلاڤ بوو بوو حجاب

سـۆرگــول و نــێــرگــز م دى يارۆ [1] وە چاڤىٚ ئەكحەله

دورٖ و لــەعــلــە يـانــە دنـــدان و لــەبــىٚ ئــەو ماهتاب

نـــوون و مــيــمــە [2] ئــەز دبـيـنـم يـانه ئەبروو و دهان

ئـــەو شـــەبــىٚ يـــەلـدايـە [3] يا كاكولىٚ پورٖ پيچ وتاب [4]

ئـــەو دو صادن وان قــەريـنـە يەك ئەليف بوو فاصله [5]

يـانـــە هــەردو چاڤ شـــريـنە كەتيە ئۆرتىٚ ئەنفىٚ ناب

ئـــەو شـــەپـالا پـــورٖ جـــەمـــالا نـازكا سـيـمـيـن بـــەدەن

ديـن و دل بـر وىٚ ژ هەر كەس با دەف و چەنگ و رەباب

يـــەك پـــيـــالـــە ژ وىٚ مـــودامـــىٚ تـو بكـە ئحسان ل مه

صـــووفـــيـــىٚ نادان [6] بـــلا بـێـــژت : خەبيثه ئەو شەراب

قـيـل و قـال و عـلـمىٚ رەسمى من هەبوون ئەكثەر ژ بەر

لامـعــىٚ بــەرقـا ئـەڤـيـنـىٚ كر طولووع ئەو بوون سەراب

ئـــەو حـــەبـيـبـا خـــوە مـــەلـەك تيرەك ل دل دا كر برين

مـــە ئـــەنــيــن و ئاه و نـالـيـن دل بــكــەت نـابـت عتاب

دەر ئــەزەل هــەر چ نـڤـيـسـی هـەر كەسی قسمەت ئەوە
هــنــگــی ڕا فــەتــوا و تــەقــوا هنگی ڕا خەمر و كەباب
ئــەز د جــەبــهـا وێ دبـيـنـتم ئايــەتا ( نـــور الـهـدی )
وێ خـــەطـا مــەعــنـا دخـــوونـم هەر وەكی كاتب كتاب
نـاكـە لازم كــو ببـيـنـە هــەر كـەس ئەو خەططا خودا
بــووجــەهــل چاوان نــەدی نوورا موحەممەدی صەواب
عــشــق و نەوق و مــەســتــی و ڕندی ب زۆر نابت بزان
نايـێـتـە جــۆش ديــز [٧] ئــەگــەر بــن دا نەبيتن ئلتهاب
دەردێ مـن يـا رەب هــەزاركی قەط نەبن نوقصان ژ بن
هــەر كـەسێ ئامين بكەت مەغفوور بت ( يوم العقاب )
ئــــەز گـونـەهكار و حەزين و بێ كەس و بێ مايەمە [٨]
كــەلــبــێ دەرگاهــم تـويــم رەحـمـەتێ ئەز يەك حوباب
مـن نەما صەبر و قەرارە ئەشكێ [٩] خوونين تێنە خوار
تــو بــكــە ئــمــداد و چارە موفلسم عــالــەم خـــەراب
نــەعـت و وەصفێ تە چ مومكن ئەز بكم شەرح و بەيان
مــەدحـــێ تـە دا ئەبكەمم گرتە ژ من سەد موستەطاب
شـــەيـــخ ( عـبـد القـادر ) ێ ثـانـی و هـممەت عالـیـی
هـاديــێ شـــەرمـــەنـدە سـەيـرا بكە ژ فەيضا بێ حساب

---

(١) يارۆ : ئەو .

(٢) نوون : حەرفا نوونە ئەوا بەرێ دەرنشيف دهاتە نڤيسين ڤێجا وەكی برويـێ لێ دهات ، و ميم : مەبەست پێ دەڤێ بچويك و گرۆڤرە .

(٣) شەبێ یەلدا : شەڤا ئێکێ یا زڤستانێ یە ، ومەبەست پێ درێژترین شەڤا سالێ یە .

(٤) پیچ وتاب : بادای وخودان گرێ .

(٥) دو صاد : هەردو چاڤن ، و ئەلیفا د ناڤ دا دفنە .

(٦) نادان : نەزان .

(٧) ئانەکۆ : ڤازان نائێتە کەلاندن .. هتد .

(٨) بێ مایە : بێ بناخە ، ب کێرنەهاتی .

(٩) ئەشك : رۆندك .

١٦

# خوزی یارا ڕوو گولناره

خوزی یارا ڕوو گولناره — بپورسانا وێ یەك جاره
ژ حالێ منێ بێچاره — کو دل بوویه سەد پاره

کو تو چاوانی ئەی ناچار — برین ته سسته یا دشوار
حەکیمێ ته کیه هەر جار — ب نازه یانه غەمخواره

بگۆتا من ئەزم بێ هەش — برین من خوون بوویه تێ ڕەش
برینداریێ تەمه دلگەش — دەوا کە من ب دیداره

ئەزم بولبول د نێڤ بوستان — دخوازم سۆرگول و ڕندان
چ کم دێ دەستەئێ رەیحان — کو سۆرگول دل بری غاره

د ئەفلاکان و شەمس و ڕۆ — ئەزم وەك نیل و فەر ئیرۆ
ب هیڤی ناکم ئەبروو ڕۆ — کو شەمسێ دل کری حاره

تویی شەمسا دلێ پوڕ بوهت — ئەزم پەروانەیا پوڕ سوهت
ب مهر و ماهێ نابم جوهت — کو شەمعێ دل کری ناره

ئـەزم دل تـەشنەئـێ سـوختی [1] تــو صـافــی ئاف و بەر بەختی
بــڕەشـــیـــن خوە ل من مەیتی غــەیـــری ئاف نـــاڤـــم پـــارە

بـــەرۆ ئـــەی هـادیێ ناچیز [2] ب دامـانـــێ شــەهــان ئاویـز [3]
ب ( عـبـد الـقـادر ) ێ ئامیز [4] ئـــەز و بـیـــن دوڕێ شەهوارە

---

(١) دل تەشنەئێ سوختی : دل تێهنیێ سۆتی .

(٢) ناچیز : چوننە .

(٣) ئاویز : دەهمەنا شۆڕ .

(٤) ئامیز : تێکەل .

١٧

# هەر کەسی تشتەك دخوازت

هـەر كـەسـی تـشـتـەك دخـوازت یا نـەعیم یا حوور عین

ئــەز دخـــوازم كــو ل دەرگــاهــێ تە بـم عەبدەك كەمین

هــەر یـــەكـی دلـخـواهــێ وی مـال وە یـا خـود مەنصبە

مــن دڤــێ دائــم هـەبـم مــەجـرووح فوئاد و دلـبـریـن

تـیـرەكـی ژ مـوژگـان تــە ئاڤـێـتـە دل و رووح بـوو نزاع

هەر یەكی ژ بۆ خوە دڤێت یەك دی ژی باڤێژ بیرە كین

تـادە وەكـی ڤــی عـــەلـیـلـی تـو ب دەردان وی ژ دەرد

تا ببت سەودا و مەجنوون تەوبە كە ژ عەقلێ رەزین [١]

مــن غـەلـەط گـۆ صـاحـب ئـسـتـغـنـانە هەر چ خوە برۆ

وان چ بـاكــە ئــەز بـبـم تـالان و هــەم ئـەنـدۆهـەگین [٢]

ئــەز حــەمـە مسكین فەقیـر و موستەمەند و بێ عەقار

قەط خەلاص ناكەت ژ دەست مسكین توانگەر ئاستین [٣]

ئــەو جـەمـالا كـو خـــودا دایــە تـە قەط نینە عەجەب

تو ب هەر كشوەر [٤] كو مەش كی ئەو ببن سەودا و دین

شــەيــخ ( عــبــد الـقــادر ) ی هممەت ژ قــوطــبــێ تاغیە
جـانفەزايە [5] ب حوببێ وان هەردەم دڤێ هادی ئەڤین

(١) رەزین : سەرخۆ .

(٢) ئەندۆهەگین : غەمگین .

(٣) توانگەر : خودان شیان ، ئاستین : دەرهچك .

(٤) كشوەر : وەلات .

(٥) جانفەزا : دل ب كەیف ، مفەررح .

١٨

# کەوثەر و شەهد و نەباتی

کـەوثـەر و شـەهـد و نـەباتی وەرە ئەی رووحێ بەشەر

زەمـزەم و ئـابـێ حـەیـاتـی وەرە پـێـش جـان و جگەر

ئاتــەشــێ سـینـە [١] نـە بەس بوو کو تە دا جان و دلە

هـاتــی با تیغ و تەبەر [٢] قەلب و جگەر کر تە دو کەر

ئایــســێ د عــارضـێ گـولـگـوونـــێ تە دا نوورا خودا

شـوبـهـی پـەروانـە ل دۆر وێ گـەڕیـا دل ب کـەسەر

ژ ( ألـســتُ ) مـەست نڤیسیبوو خـودایـێ ئـەزەلـی

هـەر چ ئـیرۆ ژ مـەیـێ نـاکـتـە بەس شام و سەحەر [٣]

بوویە مەخمووڕێ ئەبەد هەر کە دی وان نرگسێ مەست

هەر چ گۆش کر وی حەدیثەك ژ تە بیر کر وی شەکەر

مـەی بـدێ گـەر دڤێ شەهرێ تو ئەڤ تەرز و نەمەط

دێ بـدە رەهـنـا مــەیــێ عـابـدێ شەهر خەرقەئێ بەر

تـە دبـیـنـم کـو سـەراپـایـێ ژ لـوطـفـا صەمەدی

تـە بـەشــەر هـەر کە تنێ دیت وی نەظەر کریە بەشەر

ژ كــەمـــالاتــێ بــەشـــەر غــەيـرى نوبووەت چ هەبت

خــودێ وان دايــە تــە يــەك عونصورەكێ پاكێ گوهەر

مـەيـلـە مـەحــلــوولــێ بـكـە گـەشت و گوزارەك د دلـى

دل ب خوە مـولكێ مەوات بوونە وى حەى كر ب هونەر

تـــو دبـــێ بـــەس بـكـــە ئـەفغان و بكە صەبرێ دەمى

( مَــنْ جـــنـــى الـــخـــلُ فـــؤادَهْ وســبى كيف صبرْ ؟ )

تــو وى ئـەو كــەنـزێ موطەلسەم د ڤێ عەصرێ ( ولكن

ســتـــرَ الــلـــه مـفـاتــحـــهُ إنْ شـــــاءَ ظـهـــــرْ )

نەقشەبەندى ژ شەهێ تاغێ تو مەئذوون و نەخوست [٤]

فـەيض و نـسبەت ژ وى هاتى ب تە ئەى نوورێ بەصەر

ڕۆنـــى هـشـيـــارى مــەبــە مـانـعێ فـەيـضا خوە برا

( كـــلُ مَـــنْ أيـقـــظَ فـــي الـصـحـبـةِ بالـفـيضِ ظَفَرْ )

ئـــەو گـــەدايـــێ كــو ل دەرگاهێ تە يەك نسبەتێ دى

( خــاك كــويــت بـروخـش خـوشـتـر أز كـلـيـــل بسر )

ئـاتـــەشــێ ســـۆرگــولــێ روخـــسـارێ سوهتى دلێ من

دل جــەســەد سوهتى جەسەد سوهتيێ وى لبسێ دبەر

بــڕژى ژ عــيـــدا وصـــالا خـــوە ئـەگـەر نـوقطەيەكێ

دێ ژ قـــودرەت بـــبـــە شـــەق فـاعـلـێ وى بينە ببەر

هــاديـــێ نـــامـــە سـيــاه جــەورەكـێ دەرگاهێ تەيە

تــو ب ســەيـداكى [٥] تو لێكى ب كەرەم لوطف و نەظەر

---

(١) ئاتەشێ سينە : ئاگرێ سنگى .

(٢) با تیغ و تەبەر : ب شیر وتەڤرٍ .

(٣) شام و سەحەر : ئێڤار و سپێدەیان .

(٤) نەخوست : ئێکەمین .

(٥) سەیدا : ناسناڤێ شێخ عەبدررەحمانێ تاغیە ، شێخێ شێخێ شاعری .

١٩

# عومرێ من چوو ب هەوا

عـومـرێ مـن چوو ب هەوا و هەوەس و بێ خەبەری
مامە دەر غـەفـلـەت و دەر حیرەت و دەر بێ هونەری
هەر ب رەحما خوە ل سەر من ڤەکە رەببی تو دەری
لـەو ژ مـێــژ ڤـە دکشیـنـم غەم و دەرد و کەدەری
تــو غـەنــی و تــو کـەریـم و تو رەحیمێ د بەری

ژ ئــەزەل تـا ب ئــەبــەد هــەر تو کەریمی و غەنی
تــو ژ قــەلــبــێ مە دەرین حوببا ئەڤێ دونیا دەنی
تو ب لوطفا خوە موطیعی مە کە ئەڤ نەفسا گەنی
ڤـی لـەعـینی ژ مە هەم دوور خە ب مە تا نە کەنی
چـکــو رەحــمـا تــە ل پـێـشی غەضەبا تە دگەڕی

کـەتــنـــە ڤــێ دەورێ ئەخیـرێ ب قەتل و ب شەڕە
تــو دبــێ گــورگــە ب هــەڤ گرتنە نەوعێ بەشەرە
بوونە خوونخوارێ ژ هەڤ ڕا حەمی موسلم بەشەرە
والـی و صــەدر و سـەلاطـین تـو دبـێ بوونە کەرە
قــەط نــەمـا چارە ئیلاهی ل مە کە یەك نەظەری

دکـوژن هــەڤ ب تــەباهـی تـو دبــێ صەیدێ کەوە
راحەت و ئەمن و سەلامەت ژ مە چوو هەم ژی خەوە
ظـولــم پــوڕ بــوو ل دنــــێ نابینن ئەم نان و دەوە
ظــالــمـــان بـــرنـــە دەنانـیـر و درەم بــەرر و جەوە
شــوبـهــی دلبـەر ژ مـــەلا گــرتـــیـە جان و جگەری

بـەلــێ تـا قــوربــی قـیامەت دێ هەبت هنگی عباد
کــو ل سـەر حەقـقی دمەش کن ب صەواب و ب سداد
نـابـیـنــن ئـــەو ژ مـوخـالــف تـــو ضرار و تو فەساد
هـەر ب ئـەڤ ڕەنگی هەنە ناگهی وان ضوعف و فەساد
لـــەو ب ئەڤ طەرزی کری وەعدە پەیەمبەر خەبەری

هـــەر ژ ئـــەڤ نــەوعــێ عبادان ب یەقین و ب یەمین
نـاس بـکـە قــوطــبـێ هــەزانـی ب وداد و ب ئەڤین
روونـیـە بەر صوحبەتێ قەلبێ خوە ب عشقێ بکەلین
دا بـبــە خــالــی ژ ئـــەمـــراض و ببـە دوررا ثەمین
هـــەر ژ بـــۆ طـوهـرا قولووبان دکە گەشت و گوذەری

نــــەفــســا ئـنــسـانــە عـەدووێ مەزنە پوڕ ب حیەل
نـاکــوژە نـــەفسێ مـەگـەر ظللا د پـیـرانـــێ کومەل
نـــە ب پـیـرێ کـو ب تـاج دکـە ئەو غشش و دەغەل
ژ بـــەدەل نــسـبــەتـا باطــن دلێ وی پـوڕ ژ خەبەل
تـــو ب حــەقـقێ خوە کە یا رەببی هلین ڤێ ضەرەرێ

ب دورستـــی نـــه پـــەرەستییه خودایێ خوه کەسێ
بـــوونـــه بـــۆ شـــەهدێ دنێ مثلی ذوباب و مەگەسێ
کـەس د ڤـێ رەکبێ تونه سەح بکه دەنگێ جەرەسێ
خـــوه خـــەلاص کـه ژ ڤێ سجنا دونیا خار و خەسێ
ڤـــەخـــوه کاسەك ژ مەیا حوببێ د وەقتێ سەحەرێ

یـــەعـنـــی بستـیـنـه ژ دەستێ زەریا سیمی بـــەدەن
دلـبـــەرا حـــوورا بـهـشـتـێ کـو دلان بر وێ ب فەن
نـــرگسێـن چـەشمه موژە تیرە وە ڕەنگ سیبه ذقەن
قـــەدەحـــەك وێ ژ مـــەیا صاف کو ژ دل دا ڤی دەرەن
دا بـــبـــه صـــاف و بـخـوه ژ عومرێ د مائی ثەمەرێ

هـاتـی قـــورئـانـێ عــەظیم دا حەچی کافر کو هەنه
ئـاخـــرەت ئـاڤـێـتـی پـــوشـــت و ژ دنـــێ حەسکرنه
مـوئـمـــنـــێ حـــەقـقـه ب عەکسا وان هەر چ دچنه
وەرە ئـنـصـافـــێ بـکـــه کـانـــی ژ ئەڤ ڕەنگی کەنه
حـفـظـا ئـیـمـانـا مـــه کـــه رەببی د نەزع و دەبەرێ

هادی پوڕ گۆتی ب نەظم و ب نەثر نوصحێ گەلەك
گـــەر چ لـەذذەتـێ ددت ئـەو مثلی طەعام ب نەمەك
گەر نەبت هادی خودا چەندێ تەنه شوبهی خەسەك
هـەر کـەسێ عەقلێ مەعاشێ گرتیه بو ئبنی فەلەك
لـەو بـگـیـر عـەقـلـێ مەعاد گەر هەیه بۆ تە هونەری

٢٠

## ( الله ) چ عەجەب

( الله ) چ عەجەب نارەکی غەددار دەرانی

سوهتی ب وی جانی

نەقڤاشیٚ ئەزەل نەقشیٚ بەدیعەك ل وی دانی

حەیری د دومانی

هەر چ کو ژ عشقیٚ نەبت ئەو مەعدەنیٚ ئەنوار

هەم مەخزەنیٚ ئەسرار

بیٚ فائدە دیٚ هەر بچتن عومریٚ زەمانی

مەقصوودیٚ نزانی

قەصدا تەیە گەر تو بکی ئصلاحا د نەفسیٚ

مەحفووظ بکە رجسیٚ

ڕابە ب ئەدەب مەش کە ب نك شاهیٚ جهانی

گەیلانییٚ ثانی

سەد سووندیٚ دخۆم ئەز ب وان ئەبروویٚ هلالی

تو عەینی جەمالی

قەط نینە ب مثلی تە طەبیبیٚ دل و جانی

قەطبەك د ڤی ئانی

هــەر ڕۆژێ ل ســەر بـامــێ خــەراباتێ چ خوەش تێ
ئـەو حـوورا بـهـشتێ
هـــەر گـــاڤ ب عـــوشـــشـــاقـــی ددت راحـــا جـنـانــی
حەی کریە جەنانی
خـەو نـايـێـتـە چاڤان کو ببـينـم وی د خـەو دا
بـەد طالـعـە پـەيدا
خـوەش بـەختـە کو دلبەر ڤەکە بەرقەع ب عەيانی
دل شـا کـە نـهانــی
هـەر کەس کو جەمالا تە وی دی ب عەينێ قولووبە
صـافـی ژ عـويووبە
مـەمـلـووء بـبـە دل وی ژ مــەبـانــی و مـەعـانــی
وەك سەبعێ مەثانی
وی طــەطــعــەتـــێ گــولـنـاری ڤـەکـە دل کە کەبابە
دەر عەهدێ شەبابە
کـەئـســەك بــدە بـــەنـــدە ژ مــەيــا لەعلێ يەمانی
مەحبـووبـێ زەمانی
ئەز کوشتيێ و مەجرووحێ ئەوان چەشمێ دو صادم
غــائــب ژ مــــورادم
جـارەك تـــو ب ســـەر گـەشـتـيێ خودرەس ب رەوانی
ئـحـيـا کـە وی فانی

ئـەز بـەنـدەئـێ ناچار و سەگێ دەرگەمە هەردەم

تـو شاهێ صفەت جەم

جـامـەك ژ مـەیـا طەلعەت و خەددەینێ رومانی

ئـحـسـان کـە تو جانی

خـوەش دێـمـە کـو دی مە تو دبێ بەدرا مونیرە

هـەم نـوورا ضەمیـرە

لـوقـمـان صفـەتی خوەش دکی ئەمراضـێ نهانی

تـو شـاهـێ هـەزانی

تـو شـاهـی ل سـەر حـەدێ حەتا بچتە بەرییە

ئـەڤ خـەلق و بەرییە

( بـالـجمـلـە ) ژ تـە دیـتـنـە ئـەسرار و مەعانی

تـوی بـەحـرا عومانی

هەر لەحظە وەکی کەبکێ دەرێ تو کە ب مەش تێ

دل خوەشە و گەش تێ

وەقـتـا وەکـو صوحـبـەت دکی تو سرر و عەلانی

فـەیض تێ وەکی کانی

قطمیـر صفـەت سـەر ل بـەری عـوتبەئێ یارم

هـەر چـەنـدە نەزارم

( لـو یُـضـرَبُ بـالـسـیـف فـؤادي و جـنـاني

لا أطـوي عـنـانـي )

تـــو صــاحــبـــێ ئـەنـفـاسـى د قودسى و ئوەيسى

نــاســى تــه نــەناسى

تـــو مـــەخـــزەنـــێ ئــەلطافى چ زانت ب چ شانى

ئـــەڤ مـونـكـرێ ثانى

هـــەر يـــەك ب ئومێدەك دكه ئەو گەشت و گوزاره

دەر كـــووه و ديــــاره

مـــەجـنـوون صفـەتـم تەرك كرم ئامال و ئەمانى

دەر عـــشـــق و جـوانى

هەر چەند ل ڤێ ئەطرافێ هەبوون گەلەك مەشايخ

بوون بێ بەر و نى بيخ

حـــيـــنـــا ژ رەســـوولان كـــره تەشريف ب كەيانى

ئــەو قـوطبـێ حەقانى

هـــيـــزان دا خـــودا قـوطبـەكـى داوان و هەزاندا

يــەك دى ژى نـــشـان دا

گـــەيـــلانـــيـــێ ثانـــيـــيـــه ب نـــام و ب نشانى

رەبـــبـــانـــێ مـــەبانى

دەر بـــوو تـــه ئێ هجـران حەليا قەلبێ ضەعيفه

بـــوو ژار و نـــەحيـفـه

خـــوەش طـــالـــعـــێ سەعده كو ژ ئەنفاسێ دەهانى

نـــەقـشـەك ل وى دانـى

خـوەش ناتــى چ مـومكـن بكم ئەز وەصف وبەيانە

ئــەڤ خــەطط ونشانە

خـــوەش دلـبــەر و جـانـانـى تو هەم رووح و رەوانى

هـــەم شـــەهدێ زەبانى

ئـــەز كـــەلــبـــێ دەرێ شـــاهـــێ رەسـوولانێ هەزانم

هـــەر چـــەنـد نـزانـم

رەحـــمـــێ ل مـوحـــەممەد كە ب سەيدا كى تو كانى

فـــەيـضـــێ ڕا تـو كانى

٢١

# بەر ڕوویێ یار

بەر ڕوویێ یار مسکێ تەتار
نەقش و نگار مەنظووم بوو
تێدا بەرات شەهد و نەبات
ئابێ حەیات مەکتووم بوو

زولفێ رووماڵ روخسارێ ئال [(١)]
لەعلێ زەلال خەططێ دەلال
ئەو بوونە صەف وان دا ب خەف
جامەك ب کەف مەختووم بوو

عشق دایە سەر پوڕ بوو کەدەر
ئەو ڕوو قەمەر دا دل زەهەر [(٢)]
جەنگ و سەلەم ئێش و ئەلەم
ڕۆژا قەلەم مەقسووم بوو

قـەوسـێ لـەطیف ئـەنـفـا ئـەلـیف
قــەددێ مونیف (٣) زەنـدێ شـــەریـف
هــەر یــەك ژ وان ئـاڤـێـتـە جــان
تــیــر و کــەمــان مــەسـمـووم بــوو

دونــیــا تــەمــام ڕەنــــجـــە دەوام
جـامـــا مــــودام بــکــشــیــنــە کام
قــــیـــــزا رەزان وایـــــە ل هـــەزان
هـــەر چ نــــەزان مـەحــرووم بــوو

سـیـم غـەبغەبێ (٤) دێـم کــەوکـەبــێ
زولـف عـەقـرەبێ لــەب عــنـــەبــێ
جــامــەك مـولـی ژ ڕەنــگــێ گـولـی
دا وی دلـــــــــــی مـــەهـمـووم بـوو

فـاســـد مـــــزاج پـاڤـێــژە تـــاج
خـــەمــرە عــلاج جـامـــا زوجـــاج
بـگــرە ب دەســت وەك مەی پەڕەست
ئـەڤ ژ ( ألـسـت ) مــەقــســووم بوو

صـوحبەت خوەشێ کـاکـول کـەشــێ
خــال حـەبــەشێ حـاجــب ڕەشـــێ
تــیـــرا قـــزل ئـاڤـێـتــــە دل
دل کــــو ژ غـــل مـــەغـمـووم بـوو

لــــەب شــەكـــەریٚ حـــوور پـــەیــكـــەریٚ
تـــاج ب ســـــــەریٚ زێـــڕ كـــەمـــەریٚ
ئـــیـــرۆ ب كـــەرب كـــەركـــر ویٚ قەلب
دل هـــاتـــە جـــەنب مـــەحـــمـــووم بـــوو

ئـــەو خـــەد توفـاح ســیــنـــە صـــەبــاح
جـــامـــەك ژ راح [٥] وەقـــتـــــیٚ رەواح
هـــاتـــی خــــەرام دا دل تــــەمـــــــام
دل كـــــر قـــــیـــام وەك مــــووم بـــوو

دۆسـتا خـەجـەنــد ئـەو پورِ گەزەند [٦]
سیـــرەت لـــەونـــد هـــمـــمـــەت بـلـەند
زولـــفـــیٚ حـــەریر لـــێـــكـــر عـــەبـــیـر
دل كـــر مـــونـــیـــر مـــەشـــمـــووم بـــوو

نـــەقـــشـــیٚ غـــەریب خەططـیٚ عەجیب
زانـــی لـــــەبـــیـــب ڕوویـــیٚ حـــەبیب
نـــــــــوورا رەوان جــــەذبـــا جـــەنان
هـــــەر تــــم ژ وان مـــــەفـــهـــووم بوو

ئـــــەو شــــەهسوار هـــــاتـــی ب غــار
تـــیـــرەك غـــەدار تـــەشـبـیـهـی مـــار
ئـاڤـێـــتـــــە رووح دا دل فـــوتـــــووح
تـــەشبیهی یـــــووح [٧] مـەلـزووم بـــوو

فــــەریــــــــادرەس هــەر عــشقه بەس
بــاقـــی هـــەوەس نـــەفـــع نادە كەس
جـوملـه عـولووم پـێـكـڤــه سوموم
قـــال و روســـووم مـــەوهــووم بــوو

ئــەو لــەب عەقیق جـامـــەك رەحیق
دا مـــن غـــەریـق ئــەز بـــوو حەریق
جــەمـعـا دو ضـد وی كـــر بـــەدیـــد
قـــانـــوون جـەدیـد مـــەرقـــووم بـــوو

شـــاهـــێ عـەلـیـم قـوطـبـێ كـەریـم
غـــەوثـــێ عـــەظیم شـەیـخـــێ حەكیم
عـــەبـــدێ موضاف قـــادر ب نـــــــاف
سـیـــرەت عـەفـاف مـــەعـلـووم بـــوو

كـــەلـبـــێ كەمین هـــادی بـــبـیـــــن
شـــاهـــێ شـیـریـن بـابـــێ ئـــەمـیـن
دا وی نــــەجـــــات رووح و حـــەیـــات
حـــەتـــتـا مەمات مـــەرحـووم بـــوو

قــوطـبـێ هـومام ( كــهـــف الأنـــام )
ســـەیـــدا ب نـــام نـــوورشـیـــن مەقام
قـــەلـبـــێ سـیـــاه بوو ژ وی چوو ماه
ئـــیـســـلام پـەنـاه قـــەیـیـــووم بـــوو

مــەدحــێ کـەبـیـر بـــەدرا مـونـــیــر
( عــبــد الـقـدیـر ) مــەئـذوونێ پـیــر
ئـــەو بــولـبـولـە ســـەیـــدا گـــولـە
حـــەی کـــر دلـــە دەیـــیــــووم بـــوو

---

(١) روخسارێ ئال : ڕوویێ سۆر .

(٢) زەهەر : ژەهر .

(٣) قەددێ مونیف : بەژنا بلند .

(٤) سیم غەبغەبێ : ئەوا بن ئەرزنکا وێ وەکی زیڤی .

(٥) راح : مەی .

(٦) گەزەند : ڕەق .

(٧) یووح : ڕۆژ .

٢٢

## ئەو دلروبا

ئەو دلروبا دل دا ببا
شەق بوو قەبا مەغلووب بوو
لەو چوو ژ هەش مایە نەخوەش
ئەو بەخت ڕەش مجذووب بوو

ئەو ماهتاب سیمین قوباب
ڕاکر نقاب دل کر کەباب
حوببا وەطەن ئاڤێتە تەن
رووح چوو بەدەن مەغلووب بوو

حوورا بهشت دەر دل سەهشت
شەوقا کەنشت لەو وی دهشت
مال و منال ئەهل و عیال
کاسا وصال مەطلووب بوو

قــەلـبـــێ لـهــاث گـــەڕیـا دەلاث
ئـاڤـێـــت ئـەثـاث گـــۆ : ( الغـیاث )
جـامـــەك ژ مـــەی پـێ دل کە حەی
وەصـلــەت ب طــەی مـوهووب بوو

ئـــەو نـوکـتـــە سەنج پوڕ ناز و غەنج
دل کـــر ســپـــەنـج بـا ئـێـش و ڕەنج
لـــەورا ب ســــەر کـێــشـا سـەفـەر
رووح ژی دبـــەر مـــەنـــصـــووب بـوو

ئـــەو مـاه و یـــووح کاسەك صەبووح
ڕێـــتـــــە ل رووح دا وی فــوتــــووح
رووح هـات طـەرەب سنگ کر نەقەب
بـال عـــەرشـــێ رەب مـەجلووب بوو

ئـــەو شـــەنـگ و شـــۆخ بـا داچ و دۆخ
قـــەلـبـــێ کـــەلـــۆخ لـێ دایـــە مۆخ
لـــەو بـــوو نـــشـــان دامـــەن کـشـان
نـــك ( لا مـکـان ) مـەنـهـووب بـوو

چـــەشـــمــێ دو صـاد ئـــەووەل وداد
وی دا فــــوئـــاد پـــێ بـــوویـــە شـــاد
نـاگـــەه ســتـــەم جـــەور و ئـەلـەم
لـــێـــدا عـــەلـــەم مـەغـضووب بوو

حــوب كـــر نــيــاز دل بــوو جـــوذاذ
دۆســـتـــه مـــەلاذ يــا رەب مـــوعـــاذ
ڕوونــشــت ل بـــەر صـوحـبـەت ئەثەر
دابــوو جـگــەر مـــەسـلـــووب بـــوو

يــــەك دۆســـت و يـــار شــێـريـن شعار
صــوحــبــەت دشــار بـــوويـــە ديـــار
شــاهــێ هـــەزان قـــوطـــبــــە بـــزان
هـــەر چ نـــەزان مـــەحـجـــووب بـــوو

عـــومـــرێ عـــەزيـــز چـــوو بـێ تەميز
عـــەيـبـا غـــەريـــز ژێ كـــە كـــەريـــز
دل كـــە دەوا بـــاڤـــێـــــژ هــــــەوا
ئـــــەڤ بـــێ نـــەوا مـــەعـيـووب بـــوو

رووح وەك عەسەس شوبهی جــەرەس
دەر هـــەر نـــەفـــەس فـــەريـــادرەس
نـــەفـــســـا رەذيـــــل نـــابــــە ذەلـيـل
لـــەومـــا عـــەلـيـل مـەســحـووب بـوو

چـــاڤــێ د ڕەش قـــەوســـێ دخـوەش
زولـفـێ حــەبــەش ئەڤ بوونە شەش
هـــەر يـــەك ژ وان دەر دو كــــەڤــان
ئـاڤــێـــتـــە جـان مـــەسئووب بـــوو

ئـوسـتـادێ خـاص بـەحـرە خـەواص
بــوونــە غــەواص دیـنـــە مـەنـاص
عــەبــدێ فـەقـیـر وەك من ئـەسـیـر
مأیـە حـەسـیـر مــەسـبـووب بـوو

دەر دل مــەرەض حـوبـبا عــەرەض
دۆسـتــە غــەرەض باڤـێـژ عــوەض
شــەیــخــێ لـەطـیـف قامەت ئەلیف
عــونــصــر نـەظـیـف مەحبووب بوو

حــوبــب و نــەشـاط بــوویـە صراط
کــێــشـا ســمــاط بـیـز و شـەطاط
خــوارن عــەبـید شـەهــد و عەصید
دێــوێ مــەریــد مــەضــرووب بـوو

لـــەومــێ ووعــاظ هــاتــی لەظـاظ
هـــەر چ حــوفـاظ گــۆتـــن غـلاظ
عــاشـــق ئــــەوان دیـــتــــی هـــەوان
شــــوبــهــی عـــەوان مـەشـبـووب بوو

یـار چـــوو یـەفـاع ژێ چـوو شوعاع
هـــەر چ خـــداع گـــــۆ : ( الــوداع )
لــــەورا خــــوفــــاش نـابـیـنـە فــاش
شـەمــسـا ب شـاش مـەغـضووب بوو

ئــەڤ باغ و راغ ئــەڤ حەوش و جاغ
ئـــەو شــاهــێ تــاغ كــر وی چــراغ
لــەو وەك ئـەســەد ئــەو ماهێ خەد
دا مـــە مــەدەد یــەعــســووب بــوو

ســەیــدا صــەدەف زولــفــێ ب لەف
چـێـكـر ب خـەف مـەشیـا ب صەف
لـێــدا ب تــیــغ بـــۆ وی چــوو میغ
ئاه و دەریـــغ مـــەصـبــووب بــوو

یـارێ شــەفـیــق جامـا عـــەقـیـــق
پـــوڕ كـــر رەحـیــق دا مـن غـەریق
پێ بوومە مەست ئەز چووم ژ دەست
ئـــەڤ ژ ( ألــست ) مـەحـسووب بوو

ئـــەو خـوە مـەلەك زولف كر خەلەك
ڕاكـر بـەلـەك ســەر چـوو فـەلـەك
دائــم مـــودام ڕێـــتـــــە ب كـــام
دل وی مـــەرام مـەوهــووب بــــوو

ئـەڤ چـاڤ غـەزال مـەشـیـا ب حال
لـێـڤـێ زەلال خــەمــرا حــــــەلال
دا مــە ب دل ئـــەڤ ئـاب و گــــــل
ژێ چــوویـــە غـل مـەنـسووب بوو

بـابـێ سـەلـيـم قـوطـبـێ حەكيم
قـەلـبـێ سەقيم كـر موسـتـەقيـم
شـەرعـا مـوبـيـن پـێ بوو مەتين
ئـيـسـلام و ديـن مـەسطووب بوو

راحـا جـنـان هـاتـى مـەجـان
ئـيـرۆ مـە جـان تـێ دا عـيـان
ئـەو مـەيـفـرۆش هاتى خورووش
صوحبەت ب جووش پوڕ خووب بوو

ئـەو مـهـر و ماه ديـن كر پـەناه
ئـەو قـوطـب و شـاه ڕاكـر تـەباه
عـەون و مـەدەد حـوبـبـا خـەلەد
دا وى صـەمـەد مـەرغـووب بـوو

ئـەو مـشـك بوو بـەر خەدد و ڕوو
گـيـسـوو و مـوو هـەم سوو ب سوو
وى كـر بـەلاف خـەلـقـێ تـەڤـاف
بـێ قـەيـد و داف مـەكبووب بوو

ديـتـن دلا مـيـر و مـەلا
عـشـق و وەلا بـوون مـوبـتـەلا
حـوبـبـا ئـەحـەد حەتتا لـەحەد
تـێـكـل كـەبـەد مـەصحووب بوو

هــادى بـوو عــەى طـوومار بوو طەى

يـا رەب ب مـــەى تـــو دل كـە حـەى

بـابـــێ شـــێـــريـــن حـوبـب و ئـەڤين

دا وى كـــەمـــيـــن مـــەجـذووب بـوو

٢٣

# بەحثی ژ دل کە

بەحثێ ژ دل کە ئەی لەبیب
ئەو مەقصەدە گەر بنكەری
بسپێرە دەستێ یەك طەبیب
عارف د ئەمرێ رەهبەری

پورسیم ژ دلبەر من ب خەف
کان ئەو دلێ من چوو ژ کەف
گۆ پورس بکە ژ زولفێ ب لەف
مەجنوون ئەوی ژ ب خەیرکەری

پورسیم ژ زولفێ ڕوویێ مال
گۆ حالێ دل پورس کە ژ خال
خال گۆ بپورس ژ قەوسێ هلال
دل کوشت خەدەنگێ خەنجەری

پورسیم ژ قەوسێ تووزرەشی
گۆ : دینی یاخود سەرخوەشی
پورس کە ژ خەددێ گول گەشی
وی دل بری ب حیلەتگەری

پــــورپـســيـــم ژ خــــەددێ سۆرگـولە
شـــاهـــد دبـێـــن تـــە بـــەر دلـــە
لـــەو ديـــن كــــرى تـــە بولبولە
دائـــم ل بـاغـان ئـــــێــــــوەرى

خەد گۆ : ژ خەط پورپس كە خەبەر
لــــەورا ژ خـــەط تـێـتـن ئـەڤـەر
خـــەط گــــۆ خـەطا كر تە سەفەر
پــــورپس كـــە ژ لـەعـلـێ شەككەرى

پــورپـســيـــم ژ وان لـــەعـلـێ رەقـيـق
گـــۆ : غـــەبـغـــەبێ دل بر رەقيق
مـــايـــە ژ چـــاهــــا وێ خــەنـيـق
نــابـيـنـــى تــو ژ وێ ئـــەڤـــەرى

مـــام ئـــەز ل دۆرا غـــەبغـەبـــێ
گـــەهـ گـــەهـ ب رۆژ گـەهـ ب شەبێ
پـــورپـســيـــم ژ وێ لـەعـلـەيـن لەبێ
كـان ئــــەو دلـــێ تــە ژ مـن برى

گـــۆ ســـەد قـوطـاع چـێبوون ل رێ
ئـــە ژ كـــێ بـپـــورپـسـم خەبـەرێ
رەورەو بـگـێـــرپ خــــود راســـەرێ
دل نـــابـــتـــە دەســـت گـەر بـمرى

وەقـــتـــا حـــەوالـــە وان ب هـــەڤ
کـــر ئـــەر دلـــێ چـــوویی ب ڕەڤ
مـــەئـــیـــووس ژ دل مـــن گرتی دەڤ
مـایـــیـــم حـــەزیـــن و حـــەیـــیری

ئـــەو زولـف و خـال و قەوسێ ڕەش
ئەو خەدد و خەطط و لەعلێ گەش
ئـەو غـەبـغـەب و چـاهـا حـەبـەش
دل دان فـــــــدایــــــا دلـــــبـــەرێ

مـــەدهـــووش کـــەتـم ئەز وێ دەمێ
بـــــووم مـــەخـــزەنا حوزن و غەمێ
غـــــەلـطـــان دبـــووم د خاك و دەمێ
ئـــەفـــغـــــان ژ کـــەیـوان بـۆهـــەری

مـــوســتـــەغـنـی بـە دلـبـەر مودام
شاه و گـــەدا و خـــاص و عـــــــام
ســـەکـنـیـن ل پێش وی وەك غولام
حـــیـــنـــا کـــو ڕێـــتـــی کەوثەری

مـــادام کـــو مـن دل چـوو ژ دەست
چـــارە چـــیـــە ئـەی حەق پەرەست
گۆ : مەی ڤەخوی پێ بی تو مەست
بـــەحـــثـێ ژ کـــەونـــەیـن ببەری

سەد ئاه و ئاه سەد ئاه و ئاه
ئەی مهر و ماه و قوطب و شاه
مامە غەریب و ڕوو سیاه
ئمداد بکە لەو سەروەری

ئیرۆ ریا مەیخانەئێ
بنبەرە من دیوانەئێ
دا مەی ڤەخوم ژ خومخانەئێ
بەربا بکم دەردێ سەری

سەیدا کو قوطبێ عامە ئەو
پوڕ لوطف و پوڕ ئنعامە ئەو
مەی دا ب طاس و جامە ئەو
عالەم ب وی بوو ئەنوەری

ڕاکر وی قوطبێ ئەعظەمە
نسبەت ل وی ڕێت هەردەمە
هەر کەس دبێت عیسا دەمە
خوەش شاهێ ( عبد القادر ) ی

هادی ئەسیر و بێ کەسە
بۆ وی تونە فەریادرەسە
گەیلانیێ ثانی بەسە
بۆ وی حەزین و غەمخوەری

٢٤

## خوەش د بورجا عەقرەبێ دا

خوەش د بورجا عەقرەبێ دا　　کر طولووع شەمسا جهان
نوور نوما بوو د غەبغەبێ دا　　کەتمە چاها وێ عەیان

کەتمە چاهێ ب نولل و زاری　　شۆخ و شەنگێ ب زولفێ طاری
کریە تەنویر ڤی دیاری　　هەم موعەططەر وەك گولان

هەم موعەططەر هەم مونەووەر　　بۆ ژ وی قەلبێ صەنەوبەر
چونکە لێ دایە ب خەنجەر　　من ژ عشقێ دل یەمان

من ژ عشقا وێ شەپالێ　　دێم دوڕا دندان لوئالی
رووح ژ من چوو ما ل بالێ　　ما یەتیم من رووح و جان

رووح و جان بر ئەو مەجانە　　دلبەرە هەم ئەو مە جانە
جان چ کم بێ جان جانانە　　حووریا مینوو نشان

حووریا عینا بهشتێ　　وێ ب موژگانان من کوشتی
وی د جە دا من دهشتی　　بوو رەوان وێ بر رەوان

بوو رەوان ئەڤ چاڤ غەزالە     وەك پەری سوورەت دەلالە
من د پێدا دل دنالە     جادوا شێرین دەهان

جادوا شێرین کەلامە     طەلعەتا وێ طاس و جامە
هەر چ ژێ نووش کر دی کامە     وەر نە خامە دەر جهان

وەر نە خامە ناتەمامە     نووش نەکر ژ عشقێ مودامە
ژ وی وەیە کو مەی حەرامە     مەنظەرا پیرێ موغان

مەنظەرا پیران علاجە     دێ ژ وی عاشق رەواجە
تەرك دكت لەو تەخت و تاجە     گەر هەبت شاهێ زەمان

گەر هەبت ئەو شاهێ چینە     چینێ زولفان گەر ببینە
دێ ببت سەودا و دینە     دێ ببدت ئەو دل مەجان

دل مە دایە چو ژ مە دایە     دین دبێژن چوو ژ مەدایە
ئەهلێ دین گۆتن دەوایە     صوحبەتا شۆخا جنان

صوحبەتا کاکول ڕەشا من     لوولیا عارض خوەشا من
ساحرا طوررە کەشا من     بوویە دەرمانێ دلان

بوویە دەرمانێ ضەمیرە     ئەو ل تەختێ دل ئەمیرە
دل د دەستێ وی ئەسیرە     دلبەرا ئەبروو کەمان

دلبەر و هەم دلروبایە     كەنز و مصباح و شفایە
مەعدەنا لوطفێ خودایە     مەقصەلا قەلب و جەنان

مەصقەل و هەم رەهبەری تو     عەنبەر و هەم كەوثەری تو
شوبهی قەند و شەككەری تو     ئەفصەح و شێرین زەبان

ئەفصەح و بولبول مثالی     تو د عشقێ دا دكالی
سەیر دكی د ئەوطانێ عالی     پێشرەوێ شەیخ و مەلان

پێشرەوێ دێرا موغانی     بانیێ دەر دل موغانی
ساقیێ خەمرا جنانی     مەی ددی پیر و جوان

مەی ددی ب فنجان و طاسە     دل ب رەقصی بوو شوناسە
ناس كری دێر و كەناسە     تەرك كری وی خانەقان

تەرك كری لبسێ ریایە     گۆتی تەركا دل كشایە
دل ب تالانێ وی دایە     بوویە مەفتوونێ بوتان

بوویە مەفتوون و نەزارە     طالبێ دیدارێ یارە
غافلێ ژ كار و خەسارە     هەر وەكی من هەر دەمان

هەر وەكی من ڕووسیاهی     موجرمێ پیشە گوناهی
كەس نەدیتی یا ئیلاهی     ئەلئەمان سەیدا ئەمان

ئەلئەمان یا شاهێ تاغی !    صاحبێ رەوضات و باغی
باڤژە وی باغێ ڤی باغی    دا ببینم مەهوەشان

دا ببینم وان گولانە    جندی و شێرین مەلانە
دل ددن هەم بێ دلانە    ظالمن هەم دلستان

ظالماژ هادی برەندە    دل د دل دا نەقشەبەندە
ناڤ د گەیلانی د سەندە    هەر ئەوە سولطان و خان

٢٥

# ئەو دلبەرا لەب لالە

ئەو دلبەرا لەب لالە　　روخ پوڕ ژ خەطط و خالە
چاڤ نرگس و خەد ئالە　　دایە وی دلان نالە

دل شوبهەتی پەروانە　　بوو عاشقێ شەمعانە
جان دایە ب جانانە　　هەم دین و رووح و مالە

مال مائلێ خوسرانە　　کێشانە ب میزانە
خوسرانا وی روجحانە　　خوەش گوه بدە ئەڤ مەقالە

ئەڤ قەولێ ژ قورئانە　　موستەغنی ژو طوغیانە
لەو فەقرێ ژ فەخرانە　　قانع بە مە من کالە

کالێ کو دبێ طەمماعی　　بۆ طوولا ئەمەل راعی
خەیران ڕا تو مەنناعی　　گوه دێرە ب گووش بالە

بالێ کو هەبت طاری　　نوور لێ نرێژی ژ باری
عاری نەبتن ژ عاری　　ئەو بالەکی بەد حالە

گەر حال د قەلبێ ڕابە     بێ مورشدی هەر نابە
دێ ژ صوحبەتێ پەیدابە     بال مەهوەشە ئەو هالە [١]

ژ ڤێ هالێ مەبە خالی     کو خالی بی بەد حالی
نك ئەهلێ دلان کالی     نابەختە خوە بەطالە

بەططالە ب نادانی     قەلبێ نەبە ڕەببانی
یەك مورشدێ سوبحانی     وەك قالبێ دەلالە

دەلال بە ب ئحسانی     بکشینە ب حەققانی
نك مورشدێ یەزدانی     هەر قەلبێ کەڕ و لالە

دونیا ژ کەڕ و لالان     پوڕ بوو وەکی بەد حالان
ناسپێرنە دەلالان     قەلبێ خوە ماه و سالە

سال پوڕ ل مە بۆرینە     مە عەقل و خەبەر نینە
دونیا ل مە پوڕ کینە     حەسکریە مە ئەڤ زالە

ئەڤ زال کو دونیایە     شێرین و شەکەرخەندە
وەك بووکەکێ خویایە     غەددارە و حەیالە

حەیالە و غەددارە     وەك عەقرەب و هەم مارە
مەلعوونە و هەم هارە     لێ ب نەقش و خەطط و خالە

ئەڤ خال و خەططێ زائل     خەلقی كرنە جاهل
لەو ژ كونها [٢] وی مان غافل     بوون عاشق و عەبداله

عەبدال و ب نالین بن     هەم زار و ب كالین بن
دوعا كن نە ضالین بن     دونیا بڤێ ئەو ضاله

ضال ئەو كەسە بەدكارە     دونیێ ڕا علمدارە
ئاخرەت وی نە ئەفكارە     بەد كێشەك و بەد قاله

فالا وی كەسی قەنجە     كو عاشق و پوڕ ڕەنجە
پوڕ دەرد و ئەلەم سەنجە     پوڕ ئاهن و بەلباله

بەلبالێ د عوششاقان     تێ ژ دەستێ بروو طاقان
ئەو شاهن و هەم خاقان     وان زنجیر و چەنگاله

چەنگال كو ل دل مالین     دێ ژێ بچتن نالین
ئەفغان و هەزار كالین     دێ دل بكە زلزاله

زلزالێ كو دێ هلبە     دێ بیتە وی یەك جەذبە
نەفسێ وی ببینە تەعبە     دل گەش بە ب ئەحواله

ئەحوال ب خوە نەوقینە     ب علم و هونەر نینە
لاكن وان نە تەمكینە     مەقصوود ژ وان ئەعماله

ئەعمالێ‌كو د بەر حال بە      نابوختە و دێ كال بە
پوشت حالێ چ ئەعمال بە      وەك زيڤەكى پوڕ قالە

زيڤ قالێ ب ديلانێ      ب گوڤەند و ب شەملانێ
ب خاڤا سپى ملانێ      چ نايێ ژ جوهالە

جاهل كو د ڤێ عورصێ      گوڤەندێ بكو رەقصێ
كەس نابێژى ناپوڕسێ      نەقشى نە ب ئەڤ حالە

نەقشى مە ب حەق زانى      ( عبد القادر ) ێ ثانى
دەريايێ خودا دانى      دو صوحبەتێ سەييالە

سەيلان دكە ژێ نسبەت      هەم جەذبە و هەم صوحبەت
خوەش دەولەتە ئەڤ دەولەت      يا رەب نەدێ زەوالە

زائل نەكى خومخانێ [٣]      دائم كى تو مەيخانێ
ژێ نووش بكە هەم جانى      ياقووتێ مەيا ئالە

هادى خوە فەقير مايە      بێ حال و بێ مەودايە
دەست ئاڤێتە دەرگايە      بابێ شێرين و خالە

---

(١) مەهوەشە : وەكى هەيڤێ يە . هالە : سەيوان ، ئەو خەلەكا گەش يا ل دۆر هەيڤێ وڕۆژێ هەى .

(٢) كونە : ڕاستى ، حەقيقەت . (٣) خوم : دەنێ مەيێ .

ل دويف حەرفێن هجائی

٢٦

# ئیلاهی هەر تویی رەحمان

ئیلاهی هەر تویی رەحمان ب رەحما خوە دلێ مولها
ب مەی حەی کە خەلاص کە ژ وی دەرد ومحنەتێ کلها
لەطیفا دل موصەففا بوو د هیلینا خوە یا ئەصلی
ب جسمێ فانی بوو مولحەق وێ دی ئالام وموشکلها
ئەگەر ئیرۆ ژ ڤێ سجنێ سەفەر نەکشینی هیلینێ
د ڕۆژا نەزعێ دێ بکشینە ئەفغان مثلێ بلبلها
خەلاص نابە مەگەر کو ئەو بسۆژە ب ئاگرێ عشقێ
ژ ئەمراضان ببە خالی موجەللا بە وەکی گولها
ب ئەعمالێ د ظاهر نابە نوورانی دلێ بالی (١)
د ڤێ دائم ل نك پیرێ خەراباتێ (٢) ڤەخوە مولها
ل نك پیرێ خەراباتێ وێ بکشینە ریاضاتێ
ببینە دا موناجاتێ ب رەببێ هادیێ دلها

نــەجـاتــە گـەر مـونـاجـاتــە ل نك پـیـرێ خـەراباتە

دلان دكـشـیـنـە جـەنـنـاتــە ب صـوحبەتهایـێ سونبولها

ئـەگــەر پـیـری یـێ رەبـبـانـی تە وێ دیتی وهەم زانی

بــدە وی رووح وهــەم جانـــی ( دع الـدنـیـا وأهـملها )

ب ئــەڤ ڕەنــگ مـورشــد وهادی تو نابینی ئەیا هادی

وەكـی دیـتـی ب مـونقادی تو نەرم كە قەلبێ سەنكەلها

---

(١) دلێ بالی : دلێ ڕزی .

(٢) پـیرێ خــەراباتێ : مــەزنێ مەیخانــەیێ ، ومەبەســت پــێ ل ڤــێرێ شــێخێ طەریقەتێ یە .

## ٢٧

# گەر ژ دەستێ تە دنێ چوو

گەر ژ دەستێ تە دنێ چوو دوشمنێ تە بوو توراب
تو چڕا حەسرەت دکێشی هەم دسۆژی وەك کەباب
یەك نەفەس مابەینا چوون وهاتنێ دەر دەست هەیە ؟
ئەڤ قەدەر مەغرووب ب دونیایێ چیە هەم ئەڤ شتاب [١]
کۆر ئەگەر خوە ژ ڕەهبەرێ بینا [٢] کو بگرە غافلە
تو چڕا عەیبێ خوە لومێ دکی وهەم عتاب
داروێ تەلخە [٣] ب فایدە تو ژ وەعظێ تەلخ چڕا
سەر دکێشی تەعل دبی هەم نابنی وان پڕ صەواب ؟
هەر د غارا [٤] صەبرێ دا ئاڤا حەیاتێ موختەفی
تو چڕا کاسەك ڤەناخوی هەر ژ ئەڤ ئاڤا خۆشاب
ئەڤ هەل وچا دێ بەدەن ڕۆژەك ب مقراضا فەنا
دێ موقەطەع بە چڕا پوڕ ناز دگەڕی ئەڤ ثیاب
هەر پەڕ وبەرگێ ئەڤێ شاخا دنێ دێ بوەشە
تە د بن دارا دنێ دا پوڕ ب لەذذەت کریە خواب [٥]

هـــەر ژ ڤـــێ بـەخـچـێ دنــێ وەك بـا وەكـی دێ تو بچی

تــە ل ســـەر داران چـــڕا دایـــە خــوە ئەڤ پیچان وتاب (٦)

ساعــەتـا هـــادی ژ دونــیــایــێ بــچــی قەط نینە فەرق

هــا تـــو شــاه بـــی یـــا گــەدا بـی خوابگاهە ئەڤ توراب

---

(١) شتاب : لەز .

(٢) بینا : کەسێ ب چاڤ .

(٣) داروێ تەلخە : دەرمانێ تەعل .

(٤) غار : شکەفت .

(٥) خواب : خەو .

(٦) پیچ وتاب : خوار وڤیچ .

٢٨

# ئەڤ چاڤ وروخ وزولف ولەب

ئەڤ چـاڤ وروخ وزولـف ولـەب وسـيـنـە و قامەت
گـرتـيـنـە ژ شـەش ئالـی ل مـن راهیٚ سەلامەت
ئـيـرۆ کـو د دەستـیٚ تـەمـە رەحـمیٚ بکە جانا
ڕۆژا کـو مـرم فـايـدە چـيـە ئاە ونەدامەت ؟
حـالـم کـو رەمەق دەر بەدەنە ئیرۆ تو پوڕس کە
لـەو پـشـت مـرنـیٚ فائدە چ دیٚ فەصد وحجامەت
هەر ڕۆژ ب خەدەنگیٚ موژە [١] من دکوژی دبیٚژی :
کـانـیٚ بـدە حـەقـقـیٚ مـوژە بکشينە غەرامەت
دەر ناریٚ فـراقـیٚ شـەوتـيـم غـەرقیٚ د ئەشکم [٢]
ئـەڤ خـارقـیٚ عـادەت ژ تە چێبوو و کەرامەت
دکـوژی تـو عـوشاقـان و ب زنجيریٚ دو زولفان
دەر چـاهـیٚ حـەبـەش دکی هـەر ب مەلامەت [٣]
گـاڤـا کـو ل سـەر چەشمیٚ عوشاقان دمەشی تو
بـۆ خـاکـیٚ قـەدەم چـاڤ دکـن جایی ئقامەت

گـەر پـوڕسـی تـو نـیـشانـیٚ قەتیلیٚ خەط وخالان

سـیـمـا و زەر و ئــەشـکـیٚ د خـوە نـیـنـە عـەلامت

جارەك تــو ب نـازداری هــەڕی جامـع ومـەسـجد

تـەشـویش ل خەطابەت دیٚ چیٚ بە هەم ل ئمامەت

هــەر داء وبـــریـــن لـیٚ هەیە تەئـثـیـریٚ طـەبیبان

هەر دەردیٚ ژ عــشـقـیٚ یـە نـەخالـی ژ وەخامەت [٤]

هـەر کـەسـیٚ ژ عـشـقا زەریـیان بـوویە بریندار

نـا نـیـنـە شـفـا هـادی حـەتـا ڕۆژا قـیـامـــەت

---

(١) خەدەنگیٚ موژە : تیریٚ موژیلانکان .

(٢) ئەشك : ڕۆندك .

(٣) چاه : چالە .. وڤیٚ ڕیٚزکیٚ لەنگی تیٚدا هەیە .

(٤) وەخامەت : گرانی .

٢٩

# ته ل من سوهتی جەسەد

تە ل من سوهتی جەسەد جان وجگەر قەلبێ لهات
تو دبێ شوبهی تەنوور هلبوویە تێ نار وئرات
جادوا سیم بناگووش [١] زەرییا زێڕی گوهار
دایە تالانێ ل من مال ومنال مولك وئەثاث
چ بنالم چ بکالم چ فغان کم چ ئەنین
نادە من فائیدە ئیرۆ چ هەوار کم چ غیاث
دایە من ئێش وئەلەم هەم کر ل من جەور وستەم
کرمە مونقاد وموطیع شوبهی ئراضی [٢] ویەراث
گۆتی من : بوومە عەلیل ، قەط من نەما صەبرێ جەمیل
گۆتی : ( یستفسر عندي ) حەچی نك من بوو بوغاث
دل ژ من بر ب خەط وخال وروخێ شەمسی مثال
کرمە مەدهووش و ب وی صەوتێ خوەش ودەنگێ غثاث
نیم بسمل [٣] تو دبێ بوومە ژ عەجز وکەدەران
نینە من صەبر وقەرار ونە سوکوون ونە لباث [٤]
بوومە مەستووریێ ب تیرێ موژەئێ پوڕ ب نصال
هەر کی من دییە دبێ ئەڤ ئەشعەرییە یا قناث

ژار وناچار وبريندار وئەلەم كێشم ئەز
هەر ژ وان چاڤێ بەلەك زولفێ خەلەك قەوسێ دەثات
دەرد وئێش وئەلەمێ عشقێ ل من دايە جگەر
زەر وپەژموردە [5] كرم هەيئەت وحالم بوو رەثات
كرمە عارى [6] ژ حەمى روتبەء وئەموالێ دنێ
گەر وەفات كم قەط ژ من نامينە ميراث وتوراث
سونبول ونێركس ورەيحان وبنەفشان وگولان
هەر ژ وان بهن كە خوە دووركە تو ژ كار ودوكوراث
تو هەزان و ژ هيزان و تو ژ نوورشينا شرين [7]
هەر مەدەدخواهى بە هادى ب هەوار و ب غياث

---

(١) سيم بناگووش : بن گوه پيى وەكى زيڤى .

(٢) ئراض : رائێخ ، گلدە .

(٣) نين بسمل : نيڤ ( بسم الله ) ئەو ڤەكوشتىيێ هێشتا تمام نەبووى ، و ژ نوى هاتىيە دانان ل سەر ستويێ ، وهێشتا گۆتنا ( بسم الله ) ێ يا ب نيڤى .

(٤) لباث : ( اللبث ) ڤەمان وئاكنجيبوونە .

(٥) پەژموردە : خەمگين ، كۆڤاندار .

(٦) عارى : ڕووت ، ڕويس .

(٧) هيزان ونوورشين : دو جهن ل باكوورێ كوردستانێ ، جهێن شێخێن نەقشبەنديانە .

٣٠

# وەر طالبێ عشقێ بە

وەر طالبێ عشقێ بە بەلاکێش وئەلەم سەنج [١]
خالی بە ژ دەردان وببە عاشقێ پوڕ ڕەنج
سەرخوەش بە ب عشقێ ژ غەمێ دنێ رەها بە
نادانی [٢] ئەگەر تو ببی سەکرانێ مەی وبەنج
قاروون غەلطی بوو کو ئەوی جەمعی کونووزە
لەو عشقە دەفینە وئەڤین سیم وزەر وگەنج [٣]
هەر کەس کو ب جەمعا زەر وسیم ئەو هەیە مەسروور
قاروون صفەتی تێ هەیە نابێژینە وی قەنج
ئەڤ صدق ورەشادەت تو ب ڤی سەیف وخطابەت
نابێژنە تە : تو عاقلی بەل باقلێ [٤] کەم صەنج
پیر گۆتنە دنێ چو قەرارگاها مە نینە
ئەییامێ دنێ ڕا ب حەقیقەت دبێژن پەنج
دونیێ نە مەتاعێ کو ئەم پوڕ ژ وێ حەس کین
ئەڤ عومرێ ل وێ صەرفی بکن بەختێ خوە کن زەنج
ئەڤ دنێ ب خوە دوشمنە لێ بنەفش خویایە
تەشبیهی عەرووسانە ب وی قەلب ودلان حەنج

ئـەڤ كـەسـل وتـوانــی کـو ژ دەسـت نەفس ولەعینە

بـاعــث ئــەوە مــەشــهـوورە دنیٚ شێرینە وەك مەنج

ئاخـرەت كـو مـەقــامــیٚ ئـەبـەد تـە چـو کـو غـەیـبە

نــك كــۆر دلان نـابـە شـیـریـن حـەس دكـە وی ڕەنج

یـا رەبـبـی ب ئــیـمــانـەكـی كــامــل ژ دلـیٚ من

سـار كــە تـو دنـیٚ حـوببا خوە دە قەلبی وەكی وەنج

ئـەڤ چاڤیٚ ڕەش وقەوسیٚ خوەش وڕوییٚ گەشیٚ تورك

دل بــرنــە ژ مــن هـەم ژی ئـەوان ئاوریٚ پـوڕ غەنج

گــەر عـشــقــیٚ د دل چ ب دچـە ژیٚ غـل وهەم غەش

گـەر پـیــریٚ مــە هــادی تـو ب عشقیٚ دیٚ ببی گەنج

---

(١) سـەنج : پاشـگرەكا فارسـیـیە ب ڕامانـا پیڤـەر ( مقیـاس ) دئێـت ، ئانــەكو : مقیاسیٚ ئەلەمیٚ ، پیڤەریٚ ئێشیٚ .

(٢) نادان : نەزان .

(٣) سیم وزەر وگەنج : زیڤ وزێڕ وخزینە .

(٤) باقل : كەسەكیٚ ناڤدار بوو ب كێك عەقلیییٚ .

٣١

## دلبەرا سیمین بەدەنا ..

دلبەرا سیمین بەدەنا ڕوو صەباح

جان ودلم کریە برین ( بالرماح )

سورمەلی [١] وعەینەلی وهەر موژە

ماویێ زەرێ زولف کرن من صوماح [٢]

خال وخەط وزولف ولەب وچاڤ ودەڤ

شەش ئاگرن وشەشە گوللەئن شەش صەباح

گەر حەمیێ یەك جارەكی بن شوبهی تۆپ

دێ بكە تەخریب ووجوودا صحاح

گەر بكوژن سەید ومەولا ، عەبید

نینە دیەت نینە قەود [٣] ژی موباح

گەر ب سەر كوشتیێ شەهیدێ خوە بێن

جارەكی دی حەی دبن ئەو كن مراح [٤]

مەوت ومرین فرقەتا جانان [٥] بزان

صوحبەتا جانانە حەیات ونەجاح

فەیض وفوتووحە ئەدەبا صوحبەتێ

تێنە قولووبان هەزار ئنشراح

گــەر تــو ژ ڤــێ خـەمـر ومـەيـا صوحبەتێ

نــووش تـــو بـكـــی دێ تـــو بـبـی ئرتـياح

مـال وزەر وسـيـــم وروتـــەب دامــــــە وە

قـــەلـبـــێ كەباب من بەسە هەم ژی صوراح

ديـنـم ل نـك وە حـەمـی‌يان هوون حەمی

ديـــنـن ل نـك مــن ژ مـە يەك ( ذو صلاح )

هــەر كـی ژ راحـا ڕويـــێ گـولـنـارێ يــار

يـــەك قـەدەحـەك خـــوار بوويە موستەراح

هـەر كـی ب زنـجـيـر وسـەرێ زولـفــێ وی

بـــوويـــە مـــوعـــەلـەق وی دی فـەوز وفەلاح

قـامـــەتـــێ مـەوزوونێ وی طەبعێ كە جسم

هـاتـــی‌يـــە نـــەظـمـــێ وەكـــی عقدێ ملاح

طـەلـعــەتـێ مـەحـبـووبـێ دبـن گوشوار (٦)

هــەر وەكـی گـلـيــاســێ د بـەنــدا تـوفـاح

گـەر ب غـەلـەط جارەكـی پوڕسكەی ل من

دێ ب ســەمــائـی هـەڕە كــوشـی كولاح (٧)

مـورغـــێ دلم (٨) بەندی بوويە ب گيسوان (٩)

مـا ژ فـــڕيـــنـــێ پــەڕ وبـاســك وجـەنــاح

هەر كی ب دو صادێ د بن هەردو نوون (١٠)

( صـيـــدَ فـقـد صـار كـمـــاء قـــــراح )

دل كــووه دەلــيـلــێ خــوه دى بــوو ذەليل

( مــيـلـــه عـــن كــل هــوى الـنـفـس راح

كـــل مـــن احـتـــرق بـنـــار الـــهـــوى

نـــجـــم ســعـــادتـــه فـــي الأفــق لاح )

هـــادى بـــزان ذكرێ خـەط وخالــێ دۆست

مـــەرهـــەمـــە بــۆ قـــەلبێ كولێ پورِ جەراح

---

(١) سورمەلى : چاڤ كلداى .

(٢) صوماح : خوه ، كەواندن ، لێدانا سەرى .

(٣) ديەت ، قەود : دانا پارەى پێش خوينا كوشتى ڤە .

(٤) مراح : خۆشى .

(٥) جانان : دلبەران ، خۆشتڤىيان .

(٦) گوشوار : گوهار ، خەلەك .

(٧) كولاح : دژوار .

(٨) مورغێ دل : تەيرێ دلى .

(٩) گيسۆ : پرچ .

(١٠) صاد : چاڤە ، ونوون : بروىيە .

## ٣٢

# ئەی دلێ نادانێ مری

ئـەی دلــێ نــادانــێ مــری شوبهی لاخ

ڕابـە طـەرەب بینە خوە تەشبیهی شاخ

طەیـرەکی پابەستەئی تو دەر قەفەس

نـیـنە مەقامێ تە ئەڤ ئەیوان وکاخ [١]

عـالـمـە ئـەمــرە وەطـەن وجایـێ تـو

تــو دبــێ جایـی مـن ئـەڤ سەنکولاخ

مــەخــزەنــێ ئـەکــدارە دبێژن دنـێ

( سـن اوکـأیـا لـدانـمە غدار لغنە باخ )

ڕۆژەکــێ ئـەلـبـەت ژ ڤـێ دونـیـا دەنی

تـو دێ ب قــەبــری هـەڕی با ئاخ وواخ

تــو هــێ غــافـلــی ب تــەمـامـی برا

ڕابــە سـەفـەر پیشە بپڕسە سوراخ [٢]

نــیـنــە قـەرارگـاهـێ تـە دونـیـا فـەنا

وێ تــو بـکـی ڕۆژەکێ ژێ ئـنـسلاخ [٤]

پـورڕ تـو مـەخـۆ ژ نـاز ونەعیمێ دنێ

پـورڕ مـەرەضـەك پیسە دبن ئنتفاخ [٥]

پاك تــو هاتــى ب دنـىٚ ژىٚ هەڕە پاك

و تو مەكە مەسكەنىٚ خوە ئەڤ مەناخ

دنــىٚ ب ڤــىٚ وسـعــەتــىٚ تـەنـگە بزان

عـــالـــەم بـــەلايـــە وەسـيـــع وفـراخ

فـەرق وتـەمـيزى تونە ڤى عەصرى دا

بـــەقـلـــە وكـــارود ويـەك ئەو ئسپناخ

شـــاهـــىٚ بـوخـارا ب خوە ڕابە ئەگەر

يـــەك وى بـبـيـنــن وىٚ شـەيخىٚ سەلاخ

تــو دكـــى نـــەومـىٚ د فراشىٚ حەرير

پـوڕ هەنە مەحرووم ژ سوراخ و بوراخ

حـوبـبـا ڤـىٚ دنـــىٚ تە كرى كۆرە وكەرە

نـاجـهـى قـــەط شين وگرين وصوراخ

هـادى ئــەگـــەر عـاقـل وفەرزانەئى [٥]

عـەقــدا ڤــىٚ بــووكـا دنىٚ كە ئنفساخ

---

(١) كاخ : قەسر .

(٢) سوراخ ( سوراغ ) : لێگەڕيان .

(٣) ئنسلاخ : ژێڤەبوون .

(٤) ئنتفاخ : وەرمين ، پفبوون .

(٥) فەرزانە : عەقلدار .

٣٣

# ( المنه لله ) کو ژ لوطفا شەهێ سەرمەد

( المنة لله ) کو ژ لوطفا شەهێ سەرمەد

مەن دی ب عەیان زولفێ دو شەهمار ل سەر خەد

دل گەستی دو شەهمارێ وی دا زەهرێ هەلاهل [١]

لازم کو تەداوییە ب تریاقێ غەم ودەرد

دائم ب ئەڤینێ تو ژ دل باڤێ لەعینی

مالدارێ نە عاشق رەهێ راحەت ل وی بوو سەد

ڕوو ئالێ شیرین خالێ ب وی لەعلێ زەلال

سوهتی دلێ من ب ئاگرێ عشقێ وکری قەد

حینا کو برینداركری دل ب شەواتێ

( بالجملە ) ژ مال و وەلەدان دل کری وی سەرد

ئاری کو ژ باری ب دلان بیتە مەحەببەت

شا نابە ب غیر ژ باری تەعالا ب تو [٢] مەقصەد

هەر خامێ ژ عامێ چ دزانت ڤێ مەرامێ

وان جاه ومەناصب هەیە دلخواه نەشرین قەد

هەر صەرفی ونەحوی ومەعانی وبەیانی

هەم وەضعیێ بێ عشقێ هەبا بوونە ئەوان کەد

لـــەو ئـالــەتـــێ تــەفـسـيـر وئـەحـاديـث و د فقهێ

تــەفــســيــر وئــەحـاديـث سەيەيە دەركە ژ دل بەد

دەرنـاكـەڤـە بـــەد ژێ ژ دلـــێ ســاهــى ولاهـى

( إلا ) كــو ب عـشـقـێ بـبـەهـى هـەم ژى مـەشهەد

هــەر عــشــقــە ب فــريادرەسـى [٣] تــو وهــەوارى

نــە مـــال ومـنـال فەضل وهونەر علمێ موجەررەد

تـــو ســاغــى بـــريــنـــدارێ بـــريـــنــدار بە توساغى

تــو حـەيـى مـرى بـمـره تـو حـەيـى ب موحەممەد

جـارەك تـــو ب عـبـرەت ڤەكە ئەڤ چاڤێ د خەو دا

ئــەسـكـەنــدەرێ قەرنـەين ل كويە چێكرى وى سەد

ئـــەڤ مـال ووەلــەد جاە وروتـەب جوملە عەدوون

گــوهـدێـــره تـو قورئانێ كو تەصديق دكە بێ حەد

ڕۆژا كــو دو ســاقـــێ تـــە ل تــە بـێــنــە پـێـچـان

حــەســرەت دكـشـيـنـى ونـەدامـەت كى تو بێ عەد

ئەو كەس كو ژ دونيێ خوە كشاند وخودێ حەسكر

ديــن نــيــنــە تــو دينــى تـو ئەسيرێ سەبوع ودەد

ئـەى هـادى تـو ڤى قەلبێ مرى حەى كە ب هممەت

دەر صـوحـبـەتـێ وى شـاهـێ هەزانىيێ ژ سەرحەد

---

(١) زەهرێ هەلاهل : ژەهرا كوژەك .

(٢) تو : چو ، هيچ .

(٣) فريادرەس : ئەوێ د هەوارێ دئێت .

٣٤

# حسنێ حەصین عشقە بزان

حسنێ حەصین عشقە بزان
هەم ژی مەناص وهەم مەلاذ
دائم ژ بۆ نەفسا نزان
هەر عشقە حامی وموعاذ

نەفسا خەبیثا پوڕ خەسیس
نابە موطیع وهەم ئەنیس
هەر پیسە هەم نابت نەفیس
ئەوێ ب عشقێ بت جوذاذ

بفکر د ڤێ چەرخێ کەبوود
بەرباد داد عاد وثەموود
کان حاتەمێ پوڕ بەذل وجوود
ئفنا کری وان هەم فەذاذ

هەر ڕۆژ هەزار عبرەت هەیە
دل کۆرە نەفس ژی هەم صەیە
حەس کریە دونیا قەحبەیە
هەم خەمرا ئەنگوور وئەذاذ

دونــيـا مــەتــاعـــەك فــانـيـيــە
ئـــەهـــلـــێ د وێ هــەر جــانـيـيـە
نــابـــە ژ وێ قـــەط راضـــيـــيــە
( إلا ) رەزيـــل ئـــەهـــلـێ بـــەذاذ

حـــوبـــبـــا خـــودايـــێ بـاريـــيــە
كـوشـتـــى وى نـــەفـــسـا نـاريـيـە
نـــوور دايـــــە ب ئـالـــێ تـاريـيــە
ژ عـصـيـانـــێ دايـــە وى نـــەفـــاذ

بـولـبـول ژ طـەيـران عشق سۆت
عـوشـشـاقـى هــەر بـەحـثـا وى گـۆت
وان ژ طـەيـرى دى كرنـە سوكووت
لـــەو وان نـــەبـوون عـشـقـا هەذاذ

وێ قـامـــەتـا شـمـــشـــاد ونـەى
بـيــنـــە ب كـــەنـارى تــو ب مەى
مەى حوببە قەلب كريە وى حەى
گـــەر چ ضـــەعـيـفـــە وەك رەذاذ

هـــادى صـــراطـــا مــوسـتـەقـيـم
هــەر حـوبـبـە بـوو رەببێ رەحيم
كـوشـتـيـيـە وى نـــەفـــسـا لـەئـيم
غـــەيـــرى ئـــەوى رێ بـوونــە شاذ

٣٥

## دلبەرا سەروا سەهیٚ من

دلــبــەرا ســەروا ســەهــیٚ مــن
دل ژ مــن ویٚ کــریــە کـەرکەر
چ دبــت رەبــبــی شــەهــیٚ من
کــو دەوا کـــە دلــیٚ مـــەرمـــەر

کـوشــتــیییٚ دل دەست حەبیبە
ئــەوە جــەرراح وطــەبــیــبــە
عـــارفـــیٚ ب دەردیٚ کــەئــیــبــە
ددە وی ســرکـــە یـــا ســوکـــەر

جـــانـــیـــیٚ جـــان وجـــەنـــانـــە
قـــائـــدیٚ رەوضـــا جـــنـــانـــە
مــەلــجــەئــیٚ ئــەمن وئەمانە
لـــەولـــەیـــا گـیـسـۆ موعەنبەر

گـــەردەنـــا شـــووشـــە مـثـــالـــی
طــەلــعــەتـــا شەمع وشەمالی
ئـــەبـــرویٚ قـــەوســـیٚ هـــلالـــی
دلـــیٚ مـــن کـرنـە مـوعـەططەر

زەریـا ســۆرگــولا طـەلعـەت
وەكــى ڕوونـشـتــى د صوحبەت
مــەجـلسا دووری بوو جەننەت
رەقــصـــى جــان ودل وســـەر

لـــەو ( ألـست ) تێـتە وی بـیـره
دكـــــــە زاری ونـــــەفـــیـره
دچـــە هـێـــلـیـــنــا مونــیــره
( لا مـكــان ) گــۆتــنــە ئەو دەر

وارد ئـــەو عـەسكـەرێ رەبــبـە
دگــهـــى مـــەعـــدەنـا قـەلـبە
ظـولـمــەت ونــوورێ ب حەربە
ظولــمــەتــێ ژێ دكە ئەو دەر

ذەوقـــیـــە حـالــێ مـــە گۆتی
كەشف كر خوەش مەلێ بۆتی [1]
جــامـــــدێ جــاحــد گــۆتــى
دكـــە ئـــنــــكــارێ ســـەراسەر

هـــەچـى ئەرواحێ ( ألست ) ی
هــەبــوو وان ئـولـفەت ومەستی
كــو كــەتــن عــالــەمـا هەستی
دكــن ئـــەو دۆســـتـــى بەرابەر

هــەر چ بــوو ژ ئەصلی جودایە
دوور بــوویــە ژ بەحرا خودایە
دکــە ئــەفــغـــان ونــــــەوایــە
بــكـــی دا وەصـــلا مـوقـەررەر

حـەمـی یـەك ئەصله ووجووبە
وەیـــە نـــاقـــیَ غەیب غویووبە
نــەبـــوون ئـمـكـان وعـویووبە
نەبوون ئەعراض ونە جەوهەر

ئــســتــوا گــوّتــنـــە ئــەڤ حال
هەبوو عشق نەبوو خەط وخال
نـــەبـوو عەرش ونە مەه وسال
نـەبوو ئەڤ چەرخیَ مودەووەر

نـــەبـــوو ئـــەعـیـانـــیَ د ثـابت
نـــەبـــوو ئـــەرواحـــیَ موسامت
نـەبـوو ئـەمـثـــالـیَ مـــوفـاوت
نـــەبـوو ئـەشـبـاحیَ مـوكەررەر

خـــودای كــر مـننـەت ووجوودیَ
هـــەمـــی هـــانـیـنـە ووجـــوودیَ
دا بـــبـــن بـــوّ وی سـوجـوودیَ
بـگـــەڕن شـــاد ومـوفـەخـەر

خـودێ ئــەڤ جنن و د ئنسان
خــەلــق كـر جوملە ب ئحسان
دا بــبــن ســەجدە ب ئـــذعان
ژ بــۆ رەبــبـێ خوە یێ ئەكبەر

عــاشـــق ویـــارێ مـــەجـــازی
كـــو دكــــــن زاری ونـــــازی
ژ خـــودێ چــێــبـــوویـە گازی
تـــونـــە وان عـەقلێ مونەووەر

وەكـی یـــەك فــانـــی ببـینن
گـاڤــەكێ د صوحبەتێ ڕوینن
جـــەذبـــەیـەك دی ژێ ببینن
دێ بــكـــین ئەصلێ موطەههەر

غــافـــــل و ژار و فـــەقــیـرن
ب هـــــەوا نـــەفسێ ئـەسـیـرن
ئـەگــەر ئــەم شـاه وئەمـیـرن
مــە تــو نە د عەقلەكی ئەنوەر

مـــە شـــەب ورووزێ خــەیالە
كـــو چ بـــوون ژن و رجــالــە
دا بــكـــن جــەمـعـێ د مالە
ب خـــوەشـــی بكـنـە كەر وفەر

خـــودێ يـــا رەبـــبـــى كەرەم كە
مـــە ژ ڤـــێ فـــكـــرێ ب دەر كە
مــە ب جـانب خـوە ژى جەر كە
دا بـبـيـن جـوملـە موظەففەر

هــادى ڤــێ تــە پــورِ درێـژ كر
تــە ڤــێ قـــرطـاسـێ قرِێژ كر
تـــە مـــە ژى كـــەرِ وگـــێـــژ كر
ژ خــــودێ تــێــتــە مــە رەهبەر

---

(١) مەلێ بۆتی : مەلایێ جزیری .

٣٦

## ( رب العباد ) چێكر مەعاد

( رب العباد ) چێكر مەعاد
دا نیك وبەد پێ بن تەمیز [١]
مەوت وحەیات حوسن وفەساد
كر ئمتحان رەببێ عەزیز

دونیا وەكی شەهد وعەسەل
شێرینە بۆ ضەربێ مەثەل
تەشبیهی ثوومە هەمە بەصەل
تووژە ل نك عەقلێ عەزیز

كەتنە د قەبران بوون عەدەم
ئەصحاب وهەم ئەهلێ كەرەم
نینە مە عبرەت یەك دو دەم
كو ئەم ژی قەبر دێ كن گوریز [٢]

لەورا كو نەفس وهەم لەعین
چێكرنە دەر باطن كەمین
بوون موفسدێ پوڕ بوغض وكین
مە ژ بۆ جەهەننەم كرنە ڕێز

ئەڤ چار سوکوون وهەم ژی جووع
تـەنـهـائـی وتـەرکـێ هـوجووع [٣]
گـۆتـن دکـە نـەفـسـێ خـوضووع
نـــەفـس دونــە مـثلی حوبل وکیز

لازم ب دەســت عـشـقــا غـــــەدار
ســوهــتـــن ببـینـه مـثلی نــار
عــاری بــبـــە ژ عـــەیبان وعـار
هــنـگــی دبـت ئـەو پـوڕ مـەزیز

زولــف وروخ و خــالــێ حــەبـیـب
بــیــنـــە خـــەیـالـێ گەر لـەبیب
رابـطــە کــە ب وەجـهـێ عەجیب
دێ ئـــەو بـبـت خوەش خیزەخیز

فـــەوز وفـــەلاح وهـــەم نـەجـات
هــەم کـــەوثـــەر وئـابا حـەیات
حــوبـبــا حـەقـە حـەتـتـا مەمات
حـەتـتـا ب رووزێ رەستەخیز [٤]

خـــوەش کـــە ب عـشقێ دیکێ دل
دا خــالـــی بــە ژ هــەر غشش وغل
دوور بــە ژ وەصـــفــا ئاب وگل [٥]
دل هـــل بــە تــێ صــەوت وئـەزیز

ڕوونـــه ل نــك ئــەهـلـــێ دلان
لـــەو ئــەو بوزورگن هەم کەلان (٦)
هــەر صـوحبەتەك وان وەك گولان
دل پــێ دبــت پـــوڕ عـشــق ریـز

هـــەر عـــابــد وصـووفـیـێ خـام
نـــیـنـــه ژ عـــشـقـێ وان مـودام
بـــەحــشــی مـەكـه و ژ كاس وجام
نـك وان نـــەخـوارن خـەمـرا تیز

هـــەر چ نـــەخـوار ژ عشقێ شەراب
دل وی نــەبــوو ب حـوببێ کەباب
وی فـــەهـــم نـــەکــر ســررا کتاب
مــن مـوخـتـەصەر گۆ هەم وەجیز

زەرریـن گــوهــارا زولـف حـەریر
گـــەردەن شـــەمــالا خــەد مـونـیـر
مـــن دی ژ مـــن چوو سەد نەفـیـر
ئاه مـن ژ دەست ئەڤ چار چیز (٧)

قـــەوســێ ڕەش وزولـفــێ دگەش
ئــەو گـیـســووانـێ مـسك وەش (٨)
ئـــەو غـەبـغەب وچاها حەبەش (٩)
دائــم ل دل بــوون عــەطـرێ بیز

هــــادی ژ چـــارســــەد دە و دە
ئـــمـــداد طـــەلـــەب کـە دا بـدە
نـــوور وضـیـــا ب قــەلـبــێ گـەدە
( بــالــصـــاع والـکـیــل القـفیز )

---

(١) نیك وبەد : باش وخراب .

(٢) گوریز : ڕەڤ .

(٣) هوجووع : نڤستن ، ڕازان .

(٤) ڕەستەخیز ( ڕەستاخیز ) : ڕۆژا قیامەتێ .

(٥) ئاب وگل : ئاڤ وتەڤن ، ومەبەست پێ مرۆڤە ئەوێ ژ تەڤنێ دورست بووی .

(٦) بوزورگ وکەلان : مەزن .

(٧) چار چیز : چار تشت .

(٨) مسك وەش : وەکی مسکێ .

(٩) غەبغەب وچاه : بن ئەرزنك وچالا ئەرزنکێ .

۳۷

## ( الله ) كو كر عينايەت

( الله ) كـو كــر عــنـايــەت
مـەصقەل وى كر دلـێ پاس [1]
هــەم ژى وى كــر رعــايـەت
دل خــالــى كــر ژ وەسـواس

يــەعــنــى ژ دل وى زەرقــێ
ئاڤـێــت ب نــارێ عـشـقێ
مـەئـيـووس كـرى ژ خـەلقێ
هــەم حـفـظ كــر ژ ئەرجاس

عــشــق نــە ب گـريـن وزۆرە
ئــەو فــەيـض ونـار ونــوورە
دل پــێ حـــەريــق وســۆرە
بــابــارى كـــر وى ئـيـنـاس

حــەتــتــا ب زولـف وخـالێ
وێ دلــبــــــەرێ دەلالــــێ
دل نـــيــنــە جـووش وحالێ
نــابــت نـــەڤــێ ژ ئـەدناس

عشق گەر چ ئەو مەجازە
وێ بەحث ژ خەط وغازە
بال حەق ڤە كارسازە
ڕۆژێ مە پێ چن ئەی ناس

ئاه ڤێ پەڕێ تو بەس کە
دەرباز کە تو ژی لەس کە [٢]
هەر تو ژ خودایی حەس کە
راضی بە تو ب پالاس

ئەو کەس کو حەس کر ( أللّه )
دل وی دسۆژە هەر گاه
هەر گەه دکێشت ئەو ئاه
دا بکوژە نەفس وخەنناس

ڕێ دوور وپوڕ درێژە
قەلبێ مە پوڕ قرێژە
مە نەکر ئەو نمێژە
مەنعا مە کە ژ ئەنجاس

دەسمێژ ومێژێ سووری
دل نابە پێ بەلووری
ژێ ناچتن کەدووری
مە نینە عەقلێ ئەکیاس

( إن الــصـــــلاه تـــنــهــى )
گــــوه دێـــرن هــوون ب دلـها
قـــورئـــان دبـێــژه ئـــەڤ ها
مـــان ئـــەم ب فـەقـر وئفلاس

گـــەر تـــو دڤـــێ شـــەريعەت
تەطهيــر بـكــى طـەبيعەت
دوور بـــە ژ هـــەر چ بيدعـەت
ســـەيـــدائـــى بـە ب ئەنفاس

هـــەر نـــەفـــەس و مــەواقيت
كــو تـێـنـــە وان يـــەواقـيت
ضـائـــع مـــەكە ب حەوانيت
ئـــەڤ لوءلـوء وئەڤ ئەلماس

گـــەر تـــو دڤـــێ خـەلاص بى
هـــەم عـاشق و ژ خەواص بى
ڤـــێ بـــەحـــرێ دا غەواص بى
ئمداد كه غـــەوثـــێ ئەرڤاس [٣]

هـــەر عـــشــقــە رەهبەرێ تە
هـــەم سـيــم وهـــەم زەرێ تـە
هـــەم مـــێـو وهـــەم بەرێ تە
هـــەم بـــۆ تـە خضر وئلياس

هـادی مــه قـوطـب ورەهبەر
هــەم پــادشـــاه وســـەروەر
هـــەم شــاهــیٚ بـازیٚ ئەکبەر
شــاهــیٚ هــەزانــه حەق ناس

---

(١) دلیٚ پاس : دلیٚ ڕەش وەکی پارچەیا شەڤیٚ .

(٢) لەس کە : لەز بکە .

(٣) غەوثـیٚ ئەرفاس : مـەبـەسـت پـیٚ سـەیـد صبغەتەللاهیٚ هیزانیـیە کو ئێك ژ سەیدێن بنەمالا ئەرواســیانە ، وشـێخەکیٚ نـاڤداریٚ نەقشبەندییان بوو ، وشاهیٚ هەزان ژی هەر مەبەست پیٚ ئەوە .

٣٨

# تەصفیا دل کە ب مەی

| | |
|---|---|
| تەصفیا دل کە ب مەی | فایدە چ ئەڤ ریش وشاش |
| بینە ب ساز وی چو نەی [(١)] | گوھ مەدە لبسێ قوماش |
| باطنی بە تو مورید | ظاهری بە نابەید |
| دێ ب ڤی دێوێ مەرید | کۆر ببە شوبهی خوفاش |
| هەر چ ئەووەل وی هەبوون | ئولفەت وعشق وجونوون |
| دێ ببە ئیرۆ زەبوون [(٢)] | عاشق و زار وقەلاش |
| سەح کری دل یەك سورووش | لەو دکە ئەو پوڕ خورووش |
| دیزا وی تێ پوڕ ب جووش | چێ دبە ژێ ئرتعاش |
| کبر وریاء وحەسەد | ڕەش کرینە وان کەبەد |
| صاحبێ وان بوونە بەد | گەر چ بنەقشینە قاش |
| سەعیێ د عشقێ بکە | نەقشی بە ذەوقێ بکە |
| چ دکی ب صدقێ بکە | ڕاست ودورست بە تو باش |
| ڕاست بوو ئەلیف بوو سەرە | هەر چ کو خوارە خەرە [(٣)] |
| دل تژی شوور وشەرە | کارێ وی هەر تم کەلاش [(٤)] |

عاشقیێ شووریده [٥] به		هەر ب وی پەژموردە [٦] بە
عەقلێ مەعاد دیدە بە		بەس کە ژ عەقلێ مەعاش

ئاورێ وان دلبەران		نازێ ئەوان عەنبەران
بۆ دلی وەك خەنجەران		جەرحێ دکە قەلبێ لاش

زولفێ ڕوومال ودەلال		گیسووێ شەب ڕەنگ خال
لێڤێ شیرین وزەلال		مەرهەمە بوو قەلبێ خاش

تو وەرە جارەك ب ناز		ڕوونە ل سەر چەشمێ باز
دەرخە ب چەنگال وگاز		تو ژ دلم خاش وقاش

هەر توی مەوجوود وبەس		هەم توی مەعبوود وبەس
هەم توی مەقصوود وبەس		رەببی نەکی من تو شاش

دونیێ ب خوە مەعبەرە		گۆتنێ هەم قەنطەرە
نامینە کەس لێ سەرە		جەنگ وجدال وسواش [٧]

سۆرگول وهەم ژی بنەفش		خەددێ گەش ئەو زولفێ ڕەش
وەك وی تونە خووب وخوەش		هەم ژی هەشاش وبەشاش

هادی ژ قەوسێ هلال		بوویە بریندار ولال
تێتیە کەرب ومەلال		جارە وهامە وطاش

---

(١) چو نەی : وەکی نەیێ .

(٢) زەبوون : بەنی ، ئێخسیر .

(٣) خەرە : كەرە .

(٤) كەلاش : دويڤەلانكى وخاپاندن .

(٥) شووريدە : موشەووەش .

(٦) پەژموردە : غەمگين .

(٧) سواش : شەڕ .

٣٩

# دل کو غەم ودەرد وعشق

دل کو غەم ودەرد وعشق — تێ نەبە نابە خەلاص
باقێ ب وێ ژ قەلبێ زرق — هەل بە تێ نبراسێ خاص

داغ کە ب عشقێ دلە — ژێ هەڕە غشش وغلە
فایدە چ خەلوە وجلە — عشقە مەلاذ ومەناص

نەفسێ خەبیپ وکەرە — سەوق کە د خەیرێ هەڕە
گا کو د جۆتی نەڕە [1] — لازمە ژێرا مصاص

قەلبێ کەڕ وکۆر ولال — گەر نەخوە خەمرا حەلال
نینە وی یەك جەذب وحال — نابە ژ جنسێ خەواص

ڕوونە ل نك دلبەران — تەڤ بدە وان شەهپەڕان
دل ب خوە دا کەیبەران — ژێ هەرە ئەو حاص وباص

نازێ شێرین کاکولان [2] — زولفێ ڕەشێ سەر ملان
صوحبەتا ئەهلێ دلان — هەر سێ خوەشن وەك لەواص

چاڤ ڕەشێ نرکسین — قەددێ بلندێ حەسین
گەردەنا سیمین مەسین — دل د ئەوا بوو رەقاص

هەر کی ب ئخلاصێ تام　　ڕوونە ل نك ئەهلێ جام
دێ بخوە دائم مودام　　نسبەت وهەم ئختصاص

چارسەد وهەم ژی دو شەش　　فەیض دێ ژ چارسەد وشەش
نۆت ودوێ کر وی خوەش　　ثەدیێ ئەوان ئمتصاص

قەلبێ ڕەشێ قیروەش　　گەر نەکە صوحبەت وی گەش
هەر دێ بیمار [٣] بە ونەخوەش　　نابینە ئەو ئنحماص

صوحبەتا ئەهلێ دلان　　شوبهی بنەفشە وگولان
خود بینیا ڤان ملان　　باعثێ فەقر وخەصاص

پاشڤە چوون ئەڤ خوەش مەلان　　هوون وەرن ئەی جاهلان
بهن کن ژ وەرد وگولان　　مەبنە ژ فەیضێ مەحاص

صوحبەتا فەضلا خودا　　گێڕا خودێ ڤا وی دا
نابێژە شاه وگەدا　　بوویە موسلمان شەماص

شەیطان د دامار کرا　　سەد کریە ئەی برا
بەحرەئێ نوورا سەرا　　ناکی تو قەط ئحتراص

هادی خودا هادیە　　تەبلیغ ژ تە کافیە
هادی موضل باریە　　دوور بە ژ ئەهلێ شەیاص

---

(١) نەڕە : نە هەڕە ، نەچت .

(٢) کاکول : پەرچەم .

(٣) بیمار : نەخوەش ، بریندار .

٤٠

# ئەی دلێ تێرە ب عشقێ

ئەی دلێ تێرە ب عشقێ تو بکە کەسبێ بەیاض
دا ببی مەعدەنا ئەنوارێ خودا شوبهی ریاض
دلێ ئنسانی کو ژ یەنبووعێ ئەڤینیێ ڤەخوار
مثلی زەرعە ڤەنەخوە ئابێ ژ ئەمطار وحیاض
دل تژی رەین ودەرەن بوویە تەداوی مە نەکر
چ بەلادەت ل مە کو بووینە ئەم جوملە خەضاض
گەر سەری ئێشە ل تە یا خود ئەلەم بێتە ددان
دێ تەداوی تو بکی ب صەندەل وهەم ژی ب حوماض
ئەڤ دلێن قاسی ومەرمەر ژ دنێ حەس دکن ئەو
بوونە کەر نابهن ئەو پەندێ حەمی بوونە مەراض
نەکرن ناسی طەبیبان ئیلاهیێ دلان [١]
چو کو خود بینە هەیین قەلبێ ئەوان نابە مەضاض
دل ب چاکووچ وکولنکان و کەرانێ صوحبەتێ
گەر نەبە نەرمی ژ وی ناوەشە پاس شوبهی فوضاض
صوحبەتە پێ دبە حەی قەلبێ مری شوبهی میاه
دبە فەرسوودە [٢] قولووبێ گەر ببە ئەڤ ئاڤ موضاض

نــابــه هـشـيـارێ ژ خــەو ديــدەئــێ ئەڤ قەلبێ خوار

لـەو ب غـەفـلـەت تـە ئەوى كل كرييە بوويە غەماض

عــەرشــێ رەحـمـانە بزان قەلبێ حەچى موئمنێ پاك

تــە چـــڕا كــريـە دلــێ خـوە ژ بــۆ شەيطانى ئضاض

قــەلـبـى مەمسووحە دكە ژ صوحبەتێ نفرين وبەعاد

گەر لەعين جوتيە وى قەلبێ شەبەھ لەحمێ عەضاض

شـوبـهـى جــوعـلـە [٣] دكــە نـفـريــن ژ بهنا د گولان

خـسـتـيـە رەوشــێ وى پـۆزێ دكە بهن وى ب غەضاض

نــە صيانـەت نـە ديانـەت ژ وى كـەس نـابـيـنە قەط

وى خــيــانــەت وى جـنـايــەت كـرى ڕێز مثلى فضاض

دل كـو مـەحـبـووبـێ خـودا بت و ب وى ڕا بوو نەڤين

بــوويــە مــەمـسـووخ وبـيـە قاسى ب تەشبيهى قضاض

راحـــەتـــا ديـــن ودنـــێ هــەر ب ئـەڤـيـنـێ تـو بزان

هـادى هــەر ئـەهـلـێ دلـن دل دكن ئەو شوبهى محاض

---

(١) ديارە تشتەك ژ ڤێ ڕێزكێ يێ كێمە .

(٢) فەرسوودە : ئەو تشتێ ئستهلاك بووى .

(٣) جوعل : كێزگولۆل .

٤١

## ڕاست ودورست ئەز دبێم

ڕاست ودورست ئەز دبێم ... فەرشێ كرم حەق بساط
دل كو ژ عشقێ بوو كێم ... ناجیە دێ حەق صراط

بەلدەئێ عشقێ خوەشە ... تێ بكە جارەك مەشە
دێ بكە قەلبێ ڕەشە ... هەر ب خودێ ئرتباط

مەنظەرێ خووب ومونیر ... پیرێ درەوشەن ضەمیر
بوون ژ بۆ بالێ ضەریر ... مورشدێ حەق بێ شطاط

گیسووێ مەنجەستەری ... زولفێ د ماوی زەری
چار مووژی و دەروەری ... دانە دلم پوڕ شەواط

طەلعەتێ گولنارێ یار ... قەلب ودلم كریە نار
وردێ ویە ئاه وزار ... تێ ژ وی صەوت وصیاط

طوررەئێ عەنبەر شەمیم ... هاتی ل سەر دێم ودێم
دین بووم ودل بوو دونیم ... گوفت وگۆ بوو شاط وباط

هەر كی وی جامەك مودام ... ڕێتی ب كام وی دی كام
دوور بوو ژ صووفییێ خام ... خانەقە هشت ورباط

مەیخورێ مەی ئەنگووری     بوو ژ خودێ دوور وبەری
سەرخوەشێ عشقێ زەری     بوو ژ بۆ لوطفێ مەناط

مەی بخوە تو ژ خوە هەڕی     هەر چ ڤەخوار ڤی دەری
بوو وەلی دی سەروەری     دوور بوو ژ بهنا حوطاط

من دڤی عەصری نەدی     یەك بۆ ژ حەق بوو کەدی
هەر کی من دی وی خوە دی     ما د نێڤە ئەهلێ رطاط

نك خودێ دل هەر نەشین     تو ڕێ ل دل برەشین
بەیتا لەعین هەلوەشین     دا هەر ب ئاڤێژ ضراط

مەسکەن ومال ومنال     ئەهلێ دلان دی خەیال
مەعدوومێ مەحضە ب حال     دونیەء وملك ورهاط

زێڕێ زەر وزیڤێ ڤال     هەر کێ حەباندی بوو ضال
حوبا دنێ یە وەبال     بۆ وێ مەکەن هوون زیاط

حوبا خودایە نەجات     کەوثەر وشەهد ونەبات
دل ب وی دیتی حەیات     صاحبێ وی بوو عەطاط

هادی بزان تو یەقین     رەهبەرە حوبب وئەڤین
هەر ئەوە ( حبل المتین )     هەم ژی سورور ونەشاط

٤٢

# بولبول ب هەزار ئاواز

بولبول ب هەزار ئاواز　　بۆ گول هەیە ئەو چلماظ
وەك نأیە ب صەوت وساز　　هەر عشقێ وی کر ئیقاظ

پوڕ جار بەهار تێ ئەم　　دەر غەفلەتن ودور غەم
نأیێ مە طەرەب یەك دەم　　ئەم خشکن وهەم جمعاظ

گەر عاشقێ وی باغی　　وەك صووفییێ بارداغی
بێژ تاغی هەوار تاغی　　قیرین کە وەکی کو قاظ

جارەك ب طەرەب ڕابە　　بایێ صەبا ل بابە
پوڕ عاشق وشەیدا بە　　ئامانج بە ژ بوو لحاظ

ڕۆژ کو ل حەمەل جا کە　　خوە عاشق وسەودا کە
ئەمدادێ ژ سەیدا کە　　ئەفغان کە ب سەد ئەلفاظ

کبر وحەسەد وخودبین　　بەرباد ئەوان دا دین
باڤێژ ب ئەڤین ئەڤ کین　　دوور بە ژ حەچی جەوواظ

خوەش دەولەتە پوڕ فائق　　گەر تو دێ ببی عاشق
نووش کە تو ژ مەیا رائق　　گوه ژێ نەدێرە ووعاظ

ووعـعـاظـیٚ مـــورائـیـنــن ئـاگـــەھ ژ دلان نـــیـــنــن
خـــودرائـــیـیٚ د خـودبینن قـەولـــیٚ د وانیٚ فەظـظـاظ

عـاشـــق د ڕیـــیـا دۆسـتـی هـەر چ کـو هەبوون مەستی
دا و وی نـــەکـــر سـسـتـی بــوو عـاشـقـیٚ دل لەظلاظ

گـەر حـوبـب وئەڤین بی دل صـەبـر ناکە دەمەك بیٚ خل
هـــەر دل کــولـە پیٚ دەر کل بـا دل هـەیـــە ئـەو مـلـمـاظ

عـــشــق وطـــەرەبیٚ هادی هـــادی ژ بـــوٚ هـــەر نـادی
نـــادانـــی ب عـشـقـیٚ نـادی ئەڤ قەلب ودل ب غەظغاظ

٤٣

# ئەڤ هەردو چاڤێ نرگسین

ئەڤ هەردو چاڤێ نرگسین وان دل ژ من بر بێ نزاع
هەر ددو قەوسێ قەلەمین وان تیر ل دل دان بێ دفاع
دل ب زنجیرێ دو زولفان بوو موقەییەدها ئەسیر
ئاخری دل دین بوو و هەر چ دین ب زنجیرن موطاع
قامەتا شمشاد ونەی هەم طەلعەتا گولنارێ نار
هەر کێ دیت وی گۆ ژ بۆ جان ودلێ خوە : ( الوداع )
پوڕ ئەلەمکێش وبریندار ونەحیف وبێ کەسم
ناکە پوڕسێ قەط ل من مەحبووب ویارا جا یەفاع
طەوقێ گەردەن هەر کێ دیت ئەو ساعدێ سیمینێ یار
پێ ڤەدا طەیرێ هومایی [1] سایەء و دی ئرتفاع
گەر بکە تەشریف ب سەر بالینێ بیمارێ خوە دۆست
ناڤێ بیمار کو شفایە دا کو بێ سەر ڕوو شوعاع
لەذذەت وذەوق وطەرەب نینە د ئەسبابێ دنێ
لەو ژ وان ئەلبەتتە ڕۆژەك دێ بکی تو ئنقطاع
( قرة العین ) وحەیات و ( جنة المأوى ) یە عشق
هەر ب وی صافی دبی ژ ئەمراض وخالی ئەز ضیاع

چــەشـمـێ صـادا بـورهـێ نـوونـا زلفێ دالا قەد ئەليف

بــر ژ مــن صــەبــر وقــەرار وطاقـەت ومـال ومەتاع

مـــام د ڤــێ حـەبـســا دنێ دا بێ ئەنيس وبێ جەليس

بــەس بــدە مـن ئەی شـەپالــێ عــەجز وئالام وصوداع

تـــو ژ دەردان نــابــی خـالـی تـا نـەبـيـنـی دەردێ عشق

لـەو حـــەمـی جـاە وروتـەب بــێ عشق هەنە بێ ئنتفاع

بــێ خـەبـەر مـەرگــی ژ خوە دوور ئەو دبينە بێ گومان

چـار ديـــوارێ جـەسـەد نــك من لەحەد هات بێ خداع

دەر دلــێ هـــەر كــێ حـەسـەد نـيـنــە غەما دۆزەخ تنە

لـــەو دبـێـن پێتا حەسەد بوو توخمێ دۆزەخ ( بالسماع )

كـووزكـا صـەيـياد ژ خـار وخـەس [٢] هەبوون پـشدانوها

طـەيـلـەســان وخـــرقـەئـێ چـەشمينەيە وشەملا ذراع

ئـــەم ب ڤـــی عـومـرێ قەصير عاجز هەنە ژ دونيا دەنی

وای ژ بـــۆ خـضـرێ كـو مەحبووسە ب عومرێ بێ قطاع

تــو ل قــەلبـێ پـاك نـەظـەر كە نە ل ڤان شاش وجوبان

چـەشمێ سەطحی ڕا ژ بەحرا پوڕ گوهەر كەف بوو قناع

قــەط تـــنــە تـۆز وغـوبـارەك چـەشمێ ڕۆژێ ڕا يەقين

لـــێ رەمـــــەد گـــرتـــيــە چـاڤـان نابينن شەمسا لەماع

گــەر ب شـــددەت تــو هــەبـی تـەشبيهی ئەلماسێ حەديد

دێ ب ( أسرب ) شەق ببی خودبين مەبە هەم ژی رەعاع

نازدارێ پوڕ تەنەعوم ڕێ ب دۆستی نابە ئەو
عاشقی صونعێ ئەوانە کو بەلاکەش بن جیاع
گوفت وگۆیێ ناصحان بایە دل کو بوو سیاه
لەو مری نشتەر قەبوول ناکە ژ وان خوونا زراع
هەر چ بەدنەك قەنج باری قەنج ئەو رسوا دبن
لوببێ لەوزێ تەلخ دنێڤ شەککەر بزان تەلخە بەشاع
ڕوونە نك ئەهلێ دلان تو هەر صەباح وهەر مەساء
دا ببە رەوشەن دلێ تە هەم ببینە ئلتماع
ساعەتەك صوحبەت ل نك ئەهلێ دلان هادی بزان
چێترە ژ سەد سالی زوهدا خشك بێ نوور وشوعاع

---

(١) هومایی : تەیرەکێ ئەفسانەیی یە ، دەنگ وباسان دئینت .

(٢) خار وخەس : قرش .

٤٤

## بوستانە عومریٚ ئنسان

بوستانە عومریٚ ئنسان
مە ژ وی نەخوار بەرباغ
پاییزیٚ دایە سەر وان
بوون خشك داریٚ وەك ناغ

عومریٚ مە بیٚ بەها بوون
صەرف بوو ب فکریٚ قاروون
مووسایێ وەقت وهاروون
ناس مە نەکریە ئەڤ چاغ

دل ژار وپوڕ عەلیلە
بیمار وپوڕ کەلیلە
بسپرنە یەك دەلیلە
دەرمان کە دا ببە ساغ

دل مەنظەریٚ خودایە
دوور کە ژ ( ما سوی ) یە
دا بیٚتە وی جەلایە
چاڤ وی کەسب کە ( ما زاغ )

قـــەلـــبـێ سـەلـيـمـە خاشـع
دەر حـــەشـــر ونـــەشـرێ نـافـع
ئـــــەولاد ومـــــالـــە مـــانـع
كـــــــو دل ب ذكـــرى بـە داغ

مـــەعـمـــوور كـە دل ب عـشـقێ
بـــەس كــــە ژ زوهـــد وزرقێ
مـــوعـــتـــاد بــە تـــو ب صدقێ
عـــارف بـــە وەك شــەهێ تاغ [1]

ســـالـــووســـيــا ب جــــامــــە
مـــەقـبـــوولـــێ هـــەر عـــەوامـە
نـاس نـاكـــن ئـــەهـــلێ جامـە
گـــەر جـامـــێ جـام كـە ئـيـبلاغ

حـوبـب وئـەڤـيـــن ودۆســـتـــی
بـــۆ حـــەق بـكـــە ب دورســتـی
دوور بـــە ژ كـــەســـل وسـستـی
تـا كــو كـــلـــك أولـە چـــوق آغ

بـولـبـول صـفـەت بـە ئـەی جان
بـــەر ســــۆرگـــولـــێ ژ جـانـــان
بـكـشـــيـــن ســەحـەر تــو ئەفغان
دوور بـــە ژ غـــوراب وهــــەم زاغ

حوببا خودا نەجاتە
هەم سوککەر ونەباتە
وی دا دلان حەیاتە
دین ڕا عەمووده هەم ماغ

دونیا عەجووزە پیرە
وەك بووکە هەم ب مێرە
خاپاندی شاه ومیرە
وەك حەییە مارە لەدداغ

ئەڤ سال چ پوڕ وەخیمە
غەین وشین کاف وجیمە [٢]
قەتل وقتال عەظیمە
دەر کۆه وسەهل وهەم راغ

یەك نوقطەیەك ژ (عید) کەت
(حمد) پشت وی هات ب عللەت [٣]
مە ژ دەست وی پوڕ دی زەحمەت
خەلق بوون ب ظولمێ ئەوزاغ

ئەمن وئەمان وراحەت
ڤی وەقتی کریە رحلەت
مەعدوومە عەدل ورەحمەت
ناس بوون سباع وهلیاغ

هـــادی نـــەمـــا حـمـايـەت

هـــەم قـــەدر وهـــەم رعايەت

مـەلــجـــەء بـەســـە ب درايـەت

قــوطـــبــێ هــەزان شــەهێ تاغ

---

(١) شەهێ تاغ : شێخ عەبدررەحمانێ تاغیيە .

(٢) غەين وشين وكاف وجيم : دبتـە ( ١٣٢٣ ) ب حسێبا ئەبجەدی كو ل دويڤ سـالناما رۆمـی دكەفتـە بەرانبـەر سـالا ١٩٠٨ ، سـالا ڕاگـەهاندنا مەشرووطييەتێ ( دستوورێ عوسمانی ) .

(٣) يەعنی : ئەگەر نوقطەيەكێ ئەم ژ پەيڤا ( عيد ) ڕاكەين دێ بتـە ( عبـد ) ، وپەيڤا ( حمد ) ژی ئەگەر عللەت كو حەرفا ( ی ) يە د گەل بێت دێ بيتە ( حميد ) ، وهنگی دێ بتە ( عبد الحميد ) ! ب ڤی ڕەنگی شاعر ناڤێ سولتانی ڤەدشێرت دا بشێت پشتی هنگی بێژت : مە ژ دەست وی پوڕ دی زەحمەت .

٤٥

## دلبەرا زولفەین ل خەددەین بەلاڤ

دلبەرا زولفەین ل خەددەین بەلاڤ
جان ودل ودین ژ من بر وێ تەڤاف

كر ل دل ئەووەل وێ هەزار ئلتفات
داوی سوروور وطەرەب وئئتیلاف

وەقتا كو موعتادێ ب ئولفەت بوو دل
هەم ژی ب ڤێ نعمەتێ كر ئعتراف

پاشی ب تیران وخەدەنگێ موژە
كریە بریندار وێ دل بێ خلاف

دلبەر ومەحبووبان ئەوان عادەتە
كو ل عوششاقێ خوە بكن ئعتساف

صەبر وتەحەممول دڤێ موشتاق كن
دا كو ببە دەعوایێ د عشقێ ژ لاڤ

خوطوەیا ئەووەل د ڕییا عشقێ دا
گۆتنە سەرچوونە بزان بێ گوزاف (١)

بــگــره ژ خــاوەر بـچـه تـا ب ئەختەر [٢]

دێ وهــا صــەعـبـه کـو نه عاشق ب چاڤ

عــشــق چــو [٣] نـایــه دو سـەری ئەی برا

بــا نــك ســەرێ ژێــر ژ سەر ژۆره صاف

عـشـقـــه بـوو شافی ژ بوو جومله علەل

عـاشـقـــه کو ژ جومله علەل بوو موعاف

عـشـقـــه تـەعـەللوق ژ دلان باڤـژه دەر

عــشـقـه کو حوببا دنێ دوور خه ژ ناڤ

عــشــق ب زۆر و ب زەر نـائـێـتـه دەست

فـەیضا خودێ یه حەچی دی بوو عەفاف

دل ژ حــەمـی جــاه وروتـەب کـریه سار

یــار ب دو نـــوونـان و ب دو صادێ چاڤ

دۆست ب دو خەددەینێ د گولگوون وگەش

ثــقــلــەتــا دارەیـنـان ژ دل کــر خـفـاف

هـــەر کـی د نـێـڤ دامێ دو زولەفینێ وێ

دانـــەئـــێ خـالـێ د وێ دی کـەتـیه داڤ

هـــەر کـــەســـێ جــارەك دمـره ئەی برا

عــاشـقـــێ مـسکـیـن دمـره زەحف وزاف

عــیـــن ودو دال ودو ئــەلـیـف باء وقاف

ڕێ ، ژی د ئـاخـر ل مـن کر ڕێ شەفاف [٤]

غــەيــرى خــودا هـەر چ كو مومكن هەيە
مــەعـدەنــە بۆ نەقص وشەڕان بێ خلاف
هـــــادى ژ قـــــەيــــد و ژ ئـضافێ دەرى
واحـــدە هــەر مـوطـلـەق وداڤ طـاڤ وئاڤ

---

(١) گوزاف : گۆتنا ژ قەستا ( إدعاء ) .

(٢) خاوەر : ڕۆژ . ئەختەر : ستێڕ .

(٣) چو : وەكى .

(٤) مەبەست ب ( ع ، د ، د ، ا ، ا ، ب ، ق ، ر ) عەبدلقادرە كو شێخ عەبدلقادرێ هيزانىيە ، شێخێ شاعرىيە .

٤٦

# يا رەب چ دبت گەر ب مە دی

یا رەب چ دبت گەر ب مە دی ئیرۆ تو تەوفیق

دا ژ چاها ووجوودێ بدەرین پاك و ب تەزویق

لەو عومر ب غەفلەت چوو ونەفس ما دەنەس وپیس

دەر قەیدێ هەواء وهەوەسی مایە ب تەوثیق

ڤێ بووکا دنێ گەلکی سەلاطین وئەمیران

دەر گەردەنا خوە مثلی قەلادە کسرا تەعلیق

هەم گەلکی وەلییانێ خودا مثلێ د سەیدا

پشت دانە دنێ ب سێ کەڤران کرنە وی تەطلیق

ئەڤ نەفس ب تەسویل ولەعین هەم ژی ب تەلبیس

مە ژ تەوبەء وطاعاتێ کرن غافل وتەعویق

ووعاظێ ب ئەلفاظێ دکن وەعظێ بەلیغە

ئنذارێ ژ دۆزەخ دکن وجەنەتێ تەشویق

تەئثیر ژ وان نابنە کەس دەر دل وجانی

لەو عوجبێ عەجەب دەر دلێ وان چێکری تەزویق

گـەر حـەس کە خودێ فەیضـێ ب ڕێژە ب قولووبان
دێ سـەعـیـێ د مـەیـخـانـێ بـکن ڕاست و ب تەدقیق
لـەو عـشـقـە کـو تەطـهـیـرێ دکـە دل ژ عـویـووبان
هـەم ظـاهـر وهـەم باطـنـێ وان ئەو دکە تەطبیق
دەر مـەکـتـەبـێ عـوشـشاقی تنە بەحـثـێ ژ وەعظـێ
هـەر مـەشقێ مەحەببەت دکن ئەو تەحریر وتەنمیق
لاکـن د ڤـی عـەصری حەمی ناس بوونە د صووری
مـەعـنـایـێ ژ صـوورەت نـەکـرن ناس ونە تەفریق
هـەر کـەس کـو د صوورەت د مـەشی بهنا ژ مەعنا
نـایـێـتـە مـەشـام چونکە تەکر صوورەتێ تەمزیق
ئـەو کـەس کـو ژ وان مـسکێ دو زولفەینێ دەلالـێ
بـهـن کـر وی نـقـابـێ ژ دلـێ خوە کری تەخریق
ئـەو مـەنـطـقـێ شـێرین ژ دو لەب لەعلێ شەپالێ
دل هـانـێ طـەرەب جان وجگەر هەم کری تەحریق
ئـەی هـادی د هـەر نـادی مـونـادی دکـە گازی
کـو عـشـقـە طـەریـق ونابهن ئەم ژی ژ تەحمیق

٤٧

# ئیرۆ عەجەب دل هاتە حال

ئیرۆ عەجەب دل هاتە حال
قەط ژێ نەکر وی ئنفکاك
دل ما د خەیالا زولف وخال
کرنە ب هەڤرا ئشتباك

دل شوبهی طوورە پوڕ ب نوور
هاتە ئەوی فەیض وسوروور
هەم ژی فوتووح وهەم حوبوور
دەنگێ طەرەب ژێ چوو سەماك

دل مثلی کووهێ باگرە
پێت وشەوات ژێ نامرە
هەر ئاگرێ وی گوڕگوڕە
نەفسێ ژ ڤێ دیتی هلاك

یار هات ب ناز ودلبەری
وێ دل ژ من بر یەکسەری
لێدا خەدەنگێ خەنجەری
دل ما ژ من دەر خوون وخاك

ساقــــى د بـەزمێ [1] مەى گەڕاند
هـــەر چ كــو ســاغ بوو وى مراند
پـــەردە ژ قــەلــبــێ وان دەرانــد
ساغ بوون ئەبەد هەم خووب وناك

گــەر ئــەو شـەپالا زولف حەرير
گـەردەن ژ شـــووشــا موستەنـيـر
جـــارەك ببـينـه دل ضـــــەريـر
پـــەردە ژ دل دێ ئـەو كـە چاك

دلـــبـــەر ب صـەحنــێ صەومەعە
گەر مەش كە جارەك ب شەعشەعە
صــووفـــى وزاهـــد بـــەرقـەعـە
دێ ژ دل خــوە باڤن ئەو ژى باك

ئــەبـــروو هـــلالا چـاڤ غـەزال
دا مـــن ژ دوو لـــەعـــلــێ زولال
دو كـــاس ژ وێ خـــەمــرا حەلال
غـــەم چـــوو ودل بـــوو دەردناك

زولـفـــێ دو دالـــێ ڕوويـــى مال
قـــامـــەت ل مـن كر شوبهى دال
مـن ب زلـــلـــەتـــێ كـر پايێ مال
مـــن گـــۆتــێ : ( لا قصد سواك )

ئـأيــيـــنـــێ هــــەر چ دلـبــەران
دائـــــم ل دل دان خـــــەنــجـــەران
بـــكـــوژن عـوشـاقـان ب كەيبەران
لــــەو وان تـنــه قـەط خوون وباك

عـوشـشـاقـــێ عـــادەت وان ئەوە
دەر پــــەنـــجــێ بـــازێ يار كەوە
يــــان شـوبـهـى شــەخصێ د خەوە
نـــايـــێ ژ وى دەنــــــگ وحــەراك

عـــشـــق وطـــەريــق بـوو ظاهرى
شـــەش گـازە شـاشـە ل سەر سەرى
ديــــلان ورەقـــصـــە وچـار پەرى
( رب أزح هـــــــــــــــذا وذاك )

( مــــن لــــم يـــكــن في فكره
قـــصـــــداً لـــــه مـــن ذكــــره
بــــــل يـــــــرى فـخـــر أمـــره
فــهــــــو مـــــــــراءٍ ذو هــلاك )

يارەب خـــەلاص كــــە مــه ژ مـه
هـــــەر گــاڤ وسـاعـەت مه ب مه
نـــك دل مـونـــيـــرا شـوبـهى مه
نــــەفس ولـەعين بن خەشمناك [1]

گـــەر دل مــــری قـــیــزا تری [3]
ڤـــەخـــوە ژ دەســـتــێ دێم دوڕی
هـــادی وی کـــەسب کر سەروەری
لــەو عـشق وحوب تێ توخمێ ناك

---

(١) بەزم : ئاهەنگ ، حەفلە ومەجلسا شەرابێ .

(٢) خەشمناك : کەرب ڤەبووی ( غاضب ) .

(٣) قیزا تری : مەی .

٤٨

# خوەش طالع وبەختە ئەڤ حال

خوەش طالع وبەختە ئەڤ حال
دو شەمس كو بورجێ حووت كن ئقبال
ئەو هەردو ژ مەشرق ب دەر بێن
ڕوون كن ل من هەردو چاڤ وبال
يەك ڤان وى مەدارێ سەمايە دائم
يەك پەردەنشين د مەنزلا مال
يەك شەمسێ دى گەر ژ قبلە ڕابە
ئەو مەخزەنێ فەيضە هەم ژێ ئفضال
گەه ئەم د سەماء وگەه د ئەرضە
ئەو عەرشى وفەرشىيە ( بلا قال )
بۆ وى تنە قەط كوسووف ئەصلا
هەم ناكە ئوفوول هەنە ب يەك حال
دەر لەيل ونەهار ب يەك قەرارە
يەك ڕەنگە د هەفتەء ومەه وسال

ئـــەفـــلاكـــێ قـولـــووب وی جلـوەگاهە
دەر هـــەر ســـــەحـــــەر وغـــودوو وئاصال
تـــەنـــویـــر وی کـــری قـولووبێ عوششاق
گــــــەڕیـــــان ب مـــــثــــالـێ فضضەئێ قال
بـــەنـــــد کــــر وی دلان ب نـــەقشێ نووری
لـــەو گـــۆتـــنـــە نـــەقشەبەندە ( بالبال )
ئـــەڤ شـــەمـسێ د عەرشە وی سەر وپای
قـــەلـــب ژی ژ وی چـــێ دبـــە ب ئـکمال
ئەو کەس کو ڤەخوار ژ دەست وی جامەك
بـــوو پـــوختـــەء وحـــەی نەمایە ئەو کال
دل وی دێ بـــبـــــە ب شـــوبـــهـی بـــەدرێ
دێ بـــێـــژنـــــە وی : تـــویـــی ئـــەلف قال
مـــــەئـــــوا وی هــــــەزار قـــولـــووب وجانە
ســـێ روبـعـــــێ ژ وی بـــاڤ بەر جهێ دال
هـــەر کـــەس کـــو د صـوحـبـەتا وی ڕوونە
دێ ژ دل وی هـــەڕە عـــومـــــووم وبـــولـبال
ب ئـــخـــلاص ومـــەحـــەببـەت و ب تەسلیم
دل نـــــووری دبـــــن جـــــوان وهـــــەم کـال
بـــــەر فـــــەرقـــێ ئـــەنـامـێ خاص وعامی
یا رەب بـــــدە وی دەوام وئـــــمـــــــهـــــــال

بــەر نـــەهـجـىٚ قـەويم وموستەقيم هەر

تـــەشـــويـــق دكـــم ب فـەصل وئجمال

نـــەقـــشـــى ب وەقـــارە ذكـرىٚ وان خەف

دەر بـــاطـــنـــى ئـــاشـــنـــا نـە دەڤ لال

با بـــەريـــرەق ودەف ب رەقـــص وديـلان

نـــەقـشـى مـە نەدى ب ئەڤ حەرام حال

تـــەحـــسـيـــن بـكـە هەر كى ڤى حەرامى

دەر كـــوفــرىٚ دچيت ب حوكمىٚ ئيحلال [١]

هـــادى ب خـــودىٚ تــو موستەجـيـر بە

ئـــەڤ عـەصر ب فسقە ظـولـمـە ئضلال

---

(١) ل ڤێرىٚ شاعر ـ كو صووفى يەكىٚ نەقشەبەندىيە ـ دڤێت رەخنىٚ ل صوفىيێن قـادرى مەزهـەب بگـرت ئـەوێن ل دەمـىٚ زكركرنـىٚ ڕادبنـە رەقـص وسەمايىٚ ، ودبێژت : ئەم نەقشى ب ڤان حالێن حەرام ڕانابين ، وهـەر كەسـەكىٚ ڤـان حـەرامىيان حـەلال بكـەت ، ب حوكمـىٚ ( حـەلالكرنا حەرامى ) ئەو كافر دبت !

٤٩

## ئەڤ دو شەهمارن ل سەر مل

ئەڤ دو شەهمارن ل سەر مل یا دو زولفێ مشك فام [١]
یا دو فتراکن [٢] ژ بۆ نەخجیر یا دو قەید ودام
سۆرگولن ئەڤ هەردو یا دو خەدد و یا دو ماهن ئەو
یا دو شەمسن دو هلالن دۆر ئەوان کرنە دەوام
ئەڤ دو پەروینن ل دۆر ماهێ دکن جەولان گەلۆ
یا ژ زەررین دو گوهارن کرنە بەر صوورەت قیام
( حجر الأسود ) بوو دێم وچووم طەوافێ بێژنە من
یا ل سەر دێمێ حەبیبێ خالێ ڕەش بوون سەهێ دام
ئەو دو نوونێ سەرنگوونن بن ئەوان صاد بوون رەقەم
یا دو بورهن چەشمێ بادام گرتنە بەندا مەقام
ئەو دو رشتە دوڕ د نێڤ لالانە یا دندانێ یار
یا موژاکێ چەشمێ شەهلانن دلان دان بەر سهام
ئەو دو نوقرە سیم من دی بن ئابەنووسێ ڕەش شرین
یا بناگووشێ شەپالێ دێم کەزی سەر بوون لثام

یــەك بــەهــەك مــن دی د بن دو سێبێ سۆر ڤی باغی دا
یا چــەنــا یــارێ دبـــن خـــەددەیـنـێ گولگوون دێم ئمام
ئەڤ ئەلیف یا سەروە بەرچوو یا خوە نەیشەککەر من دی
یا نـــە تـــورکـــام کـــر قـــیـــام ودێـــم قـــەدد وبالا تەمام
ئــەڤ مــەلــەك یا مــەه فەلەك یا حوورمینو بوو من دی
یـا پــەری پــەیـكـەر حەبیبێ شوبهی خوور نوور دا وی عام
کــەعـبــەیــە یــا ( جـنــە الفردوس ) ە ئەڤ یا طیبەیە
یـا ب گــونــدێ شــاهـــد ومـەحـبـووبێ تورکا خوە گهام
حــاجـیــە ژ ( بـیـت الـحـرام ) تێن کو دکم ئەز وان شرین
یا دو دەســـتـــێ مــن حــەمائل ل گەردەنا دۆستی بوو شام
ئـــەو مـــەســیـــن زیــڤــە م دی یا نـرگـلا سیمینە ئەو
یـا نــە ئـیـرۆ ئــەز دبـیـنـم گـــەردەنـــا یـــارا هـومـام
بـــولـــبـــولـــە ئــەڤ یـا هــەزارە تێ ژ وێ نەغماتێ خوەش
یـــا جــگـــەرســووز وبـــریـــنـــدار هــادیــێ شێرین کەلام

---

(١) مشك فام : ڕەنگ مسك ، کو ڕەشە .

(٢ ) فتراك : ئەو وەریسە یێ نێچیرڤان ب پاشییا زینێ هەسـپی ڤـە گـرێ ددەت دا نێچیرا خۆ تێ بدانت .

٥٠

## م ژ دل بوو جاری

م ژ دل بوو جاری ئەفغان وزاری
دا سەح کە شێرین ب من دە تەسکین
وە گەر نە ئیرۆ وەك سەیلێ شیرۆ
ئەشکێ دخوونن دێ من کە تەطمین
ئەڤ هەر چ دلبەر وان دل کر وەك بەر
دەست وان ب خەنجەر دل کرنە کەرکەر
هەر چ عوشاقن ژ صەبرێ طاقن
نالین وکالین وان رەسم وئایین
مەیلا د یارێ وێ نازدارێ
دا من قەرارێ ژ بەیت ودارێ
دێ سەر ل بابم ل جەولان خویا بم
تەشبیهی گۆیین دێ بکمە نالین
دێ صەرف ونەحوێ صەرف کم ب مەحوێ
مەنطق ب قەهوێ سەکرێ ب صەحوێ
دێ ئەز ب دل کم نا بە دەغەل کم
صوورەت ب ڕەنگین دل بە ب سەرگین

ئەی دل تو ڕابە بەس کە ژ خوابە
دونیا سەرابە نادەتە ئابە
تو ناکی دەبریٚ دیٚ بچی قەبریٚ
با ئاه ونالین دیٚ ل وی کی تەمکین
دونیا مرارە ب جەور وخەسارە
پاشی زەرارە خەلق بوونە هارە
دوکژن ب ظولمە هەڤ کرنە قیمە
ناس بوونە بیٚ دین بیٚ ڕەحم وتەئمین
عبرەت نەمایە دل بیٚ دەوایە
وەعظ بوو هەبایە دین بوو هەوایە
لەو زێر خویا کر وی دین ب با کر
خەلق بوونە گورگین پوڕ بوغض وپوڕ کین
ڕەفع بوو دیانەت هەم ژی ئەمانەت
پڕبوو خیانەت نینە صیانەت
وەکی دەواران بەردی بەیاران
خوارن بوو شێرین گوه نادە کەس دین
ئەڤ ئەهلیٚ ئەڤ وەقت دین جاه وهەم ڕەخت
پوڕ بوونە دل سەخت ژ ئاخرەت ڤە بەد بەخت
گوه نادنە علمی مەیل دانە ظولمی
دین بوویە تەخمین کەرکرنە تەحسین

ئـــيـــمـــام غـــةزالـــى ئـــــەو روتـــبـــە عـالـى
خـــوەش سـوفـت لوئالى گــــۆت وى ب دەلالـــــى
دێ ژ دەســـت ئەمـيـــران هـــەم ژى دەبـــيـــــران
كـــاســــد بـــە ئەڤ دين ئـــەو وەقـتـە ئەڤ حين

قـــەط كـــەس تـــە ديتى خوە ژ ظولـمـــێ گـرتـــى
قـــاضـــى ومـــــوفـــتـــى ديــــن دان ب پـــورتـــى
شـــەيــخـــان ب تــاجـان مــــەلا ب كـــاجــــــان
خــاپـــادنـــە شـەمدين شـــاهــيـــن وتــاجدين

يـــا رەب تـــو چـێـكـى فـــەيـضـەك ب ڕێـكى
مـــە حـــەق د ڕێ كـى كـــرنـــە ب كـــەرێ كر
دەلـــيـــل كـــو گــور بە دێ دل ژى كـــــەربـــــە
جـــرتـــك دێ بـــاڤـيـن شـاكـــن شـــەيـاطـيـن

بــكـــنـــە يـــەقـيـنـــە ئـــەڤ ســـەرســـەرينـە
ڤـــى تــــــەرزى ديـــنـــە كـــو مـــال جـــڤـيـنـە
دا بــــبـــنــــــە ئـــەو ناس مــــال بـــدنـــە وان ناس
بـــبـــنـــە ژ بـــەطـالـين ضـالــلـــيـــن موضللين

هــــەر چ كـــو نـــەفـــســـە وى ديـــتـــى كـــەيـسـە
گـــۆ رەقـــص مـن بەســـە شـــەيـطـان كو نەحسـە
گـــۆ : لـێـدن هــوون دەف رەقـص كـن ب لەف لەف
هـــوون بـــبـــنـــە عـالـين عـالـــى مـــــوريــــدين

نــــەفــس ولــەعینــە گـــۆتـــن : مـــە دینــە
دەف رەقـــصـــێ نـینــە بــەیـــرەق شـــێـــرینــە
بـــەیـــرەق کو کـر سۆر دێ بـــێـــنـــە بـــن گـــۆر
دێ بـــکـــنــــە کـــالـــین شـــەوق دێ بــە شێرین
شـــەیـــطـــان کو دەرسان دا ڤـــان خـــەســیـــسان
گـــۆتـــن : مـــە دیسان دوڕ دی د کــــیــــســـان
شــــەیـــطـــان ب حیلان وان هـــانــــی دیــــلان
ژن هـــاتـــن ونـــێـــڕین بـا خـــەمـــل وتـــەزیـــین
ئـــەمـــرێ ب مـــەعرووف ئـــەڤ گـاڤـە مـەلفووف
ب حـــوسنـــە مەوصووف مـــەنـــهـــیـــێ مەکفووف
هـــادی تــــە حـــەق گـــۆ نـــاس بـــوونـــە بێ گـــۆ
دان فـــعــلـــێ شـــەیطین تــــەرویــج وتـــەحسین

٥١

## ژ دەست وێ سەروێ بالائێ

ژ دەست وێ سەروێ بالائێ
من دیتن زەحمەت ودەردە
ژ سەر شەمسا موحەیائێ
کو ئاڤێت پێچە وپەردە

ژ وێ شەمسێ دلێ بیمار
حەرارەت دیتی وی سەد جار
ژ خوە چوو قەط نەما هشیار
ژ نووڤە دێ برین سەردە

د رێیا دلبەرا شێرین
ددم جان ودل وهەم دین
حەچی کو سەح کن ئەڤ ئایین
دێ بێژن : خوەش جوان موردە

چو دیت من ئەو قەد وقامەت
قیامەت ( قلت : قد قامت )
( هموم البال قد دامت )
دێ بێن : ئەڤ ساغە یا موردە

کــەتــم ڤــێ جــەنگ وغەوغائێ
ژ بـــەلـقــیــســێ خــەبـەر نائێ
مــەگـــەر هــودهــود ژ سـەبائێ
بــەشـــارەت بـیـنـە ئـەڤ عەردە

حــەمــەل مـەحـمەل کو ئاڤێتی
ل ثــەور کـــر مـەحـمـەل وپرتی
ڤێ بورجێ ب عەکس کر کورتی
دێ نـــیـز بـی ئەو سیەهـ چەردە

ئـــەگــەر ئــەو گیسۆیێ طەررار
ژ ســـەر دێــمـــی بــەرەڤـدە یار
ل مـــن دێ روون بـکــە ئـەڤ دار
بــبـــە ژی تـــۆز وهـــەم گـەردە

ژ خــەمــل وپـیـشـی و جەکبەند
دلــێ مــن کـــر وێ قــەیـد وبەند
ل مـن کـــر چار طەرەف دەربەند
خـــودێ کـی ئـیـرۆ مـــن بەردە

ب چاڤ ودێـــمـــێ ئــەنـوەر من
ب کـوشــت وهـشــتی ئەسمەر من
دێ ســـاغ بــم بێتە گەر سەر من
ل مـــن کـــە مــســـك ومـاوەردە

زوحـــەل دێ ل مـــن ببه شەمسه
دێ چـــار بگـــره جهـــێ خەمسه
د نـــووریٚ دێ بـــبـــم غـــەمـسه
خـــويـــا بـــە نـــازپـــەروەردە

زمـــســـتـــان هـــات وبـوهـۆری
نـــەگـــرتـــه بهـــن گـــولا جۆری
رەبـــيـــع هـــات وتو نەی دووری
تـــو بهـــن کـــه ئـەڤ گولا زەردە

ئـــەوان دو بـــەدر ودو صـــادان
ئـــەوان دو قـــەوسـێ صەيـيـادان
ل مـــن وان چـــار طەرەف دادان
دێ يـــار دل مـــن ب خـەنجەر دە

ژ وان وەك لـوئـلـوئـــێ دنـــدان
دلـــێ مـــن دايـــه بـــەر سنـدان
ل گـــونـــدان بـوومـه سەرگەردان
فـــەقـــيـــر وژار وپـــەژمـــوردە

کـــەمـەر دێ ل کوو بکه بەندە ؟
مـــيان مـــوويـــا [١] شەکەرخەندە
بـــرێـــژە ژ گـــەر دو لەب قەندە
دێ تـــيـــرەك ئـەو ل ئەشعەر دە

**دو خــەد وێ وەك گــولا سۆرە**
**كــەزی وێ لـەیـلــێ دەیجوورە**
**دەهان غـونـچـەئێ پوڕ هوورە**
**دبـێــم لـەو جـەوهەرەك فەردە**

**غـذا [٢] ڤــی رووح وجـانێ من**
**شــفـــا دەردێ جــەنـانــێ من**
**زولالــە ژ لــێــڤــێ خانێ من**
**كــو ســـەر جـان ودلـم بەردە**

**ژ وان تـیـــرێ خـــەدەنـگـێ وی**
**ژ وان خوەش صەوت ودەنگێ وی**
**ژ وان سـیــم زەنـد وچەنگێ وی**
**ژ مــن چـوو خواب وهەم خردە**

**ئــەگـــەر جـارەك ب دلــداری**
**تــو تــەشـریف كی ئەڤی داری**
**بــبـێــژی رووح دە یـەك جاری**
**بــدم دێ رووح وەكـــی بـوردە**

**دنـــێ پـــوڕ بـوو ژ طەرراران [٤]**
**تــو دل مەسـپـێـرە ڤــان خاران**
**كــو مــەعــدوودن ژ خـام كاران**
**دلــێ خــوە ب شـاهێ ئەنوەر دە**

ژ مـــەحـبـووبـان ئــەوە سەروەر
نــەبـات وشــەهـد وهەم شەككەر
درێـــــژە د صـوحـبـەتێ كەوثەر
تو دل ب ئەڤ شاه وقەيصەر دە

چـــو هـــــادى نـــاز ژ وى زانـــى
ل عـــەكـســـــا نـــاز ســـەر دانى
بـــەيـــان كـــر جايـێ ئەڤ خانى
نـــەظـــەر دە تەختێ ئەڤ نەردە

---

(١) ميان موو : ناڤتەنگ زراڤا وەكى موى .

(٢) غذا ( غذاء ) : خوارن .

(٣) خردە : خرەد ، عەقل ، هۆش .

(٤) طەررار : دزيكەر .

٥٢

## یا رەب چیە ئەڤ عەصرە

یا رەب چیە ئەڤ عەصرە　　حەق نابێژە کەس یەك موو
بوون خائن وبەد زومرە　　هەر کەس بوویە ئەو بەد گۆ

دین دانە ب دیناران　　زانن خوە ژ دینداران
یەك دینە گول وخاران　　خوە ژ دین کرنە یەکسوو

صەیادێ د فووم [1] گرتی　　حەیالەکێ دێرجمتی
دا جەمع بکن پرتی　　رەقصین و ل دەف دانۆ

سۆر کەسکە ژ بەیراقان　　دانە سەری مزراقان
دان سەر ملێ چیپ چاقان　　حال گۆتن وهەژیانۆ

گۆتن دێ ب ئرشادی　　دەر هەر بادی ونادی
مەش کین ب ڤی موعتادی　　( فلیتبعوا من خانوا )

حەتتا ب لجێ هاتن　　دیتن کو ئەڤان قاتن
بوون تابع وبوون ماتن　　ئەڤ کالی ودلوانۆ [2]

یەك پیرێ قەلەندروان [3]　　تەجویز دا وان ئەڤ ئاوان
گۆت مەسجدێ کن دیلان　　( شدوا علی ما کانوا )

| | |
|---|---|
| ئەڤ جاهل ونادانن | رەققاصێ د مەیدانن |
| ب ئەڤ حالێ خوە شادانن | ( قد شانوا وما زانوا ) |
| شاهد ژ بوو حالێ وان | رەقصینە د مالێ وان |
| نێڤ ئەهل وعیالێ وان | قەنجێ د ئەوان قوردۆ |
| مونکەرێ بوویە مەعرووف | مەعرووفێ بوویە مەلفووف |
| حەققی کو بوویە مەکفووف | ( لا یدرون ما قالوا ) |
| ئەڤ دەورێ ئەغبەر دا ئەم | بوون صاحبێ دەرد وغەم |
| پوڕ بوو ل مە هەم ژی هەم | حەیر مانە د نێڤ ئەڤ دو |
| پەژموردە بوو ئەڤ عالەم | وەك گور بوو بەنی ئادەم |
| گەڕیان ژ بۆ دین ئەڤ دەم | دو چاڤ ل من بوون دو جۆ |
| دوور بە تو ژ بەد حالان | دەر ڕۆژ ومەه وسالان |
| تو قەط مەکە ئەڤ قالان | دەر کووه تو بکە کۆکۆ |
| تو ژ طەلعەتێ مەهتابە | ڤەخوە تو مەیا نابە |
| مێژکە بکە محرابە | وان قەوسێ کەمان ئەبرۆ |
| بسپێرە خوە حەق پیران | وەك بەگلەر وهەم میران |
| دۆر خوە مەکە تو ژ تیران | دا بێنە تە تیر ئیرۆ |
| غیرەت کە خوە بگهینە | تو ب دلبەرا شێرینە |
| دا ژ دل تە ببە کینە | تەعطیر تە بکە ب گیسۆ |

دل کو نەبە رەببانی — گەر عالمێ نادانی
من ژ بۆ دل خوە زانی — خالێ روخێ وی دارۆ

من قەط نەدی دەییارە — کو ب قووەتێ نەظظارە
فەرقەد ب گول وخارە — ئەو ناس بکە ب کەف نۆ نۆ

گەر طالبێ دیداری — بکشینە ژ دل زاری
دا تو بکی وی یاری — بهن کی ژ گولا مینۆ

ئیسلام بوو غەریب ئەڤ گاڤ — هەر کەس بوونە ئەو بێ چاڤ
فەرق ناخنە داڤ وطاڤ — هەم شیرن وهەم بهنۆ

هەر چی کو موعین دینە — یا رەب وی بشدینە
هادی تو بێ ئامینە — خەلق لالن وهەم بێ گۆ

---

(١) فووم ودیرجمتی : دو گوندن دکەڤنە دەڤەرا لجێ .

(٢) کاوان ودلوان : دو تاخێن لجێنە .

٥٣

# ژ خەددێ سۆرگولێ خوە

ژ خـــەددێ سۆرگولـێ خوە كرمە دل كەی

ڕەشـانـــدی وێ ل دل مـن جامـەكـی مەی

ژ گـولـنـارێ روخێ خوە جانێ من سوهت

دل وئـەحـشايــێ مـن وێ كريە هەم شەی

ژ غــەيـــران كـــو دلــێ خــوە تو كە خالی

حەچـی ئەغيار ژ دلێ خوە كريە من قەی

مــەبــە دلـبـەنــدێ ڤـێ دونـيـا دەنــيـيـە

دێ بـمـرن نـامـيـنـە يــەك فەردەكێ حەی

ل كـــوويــە قـەيـصـەر وفەغفوورێ چينی

ل كـــوويـە كـەيـقـوبـاد وخـەسـرەو وكەی

ب هــەمـيـانـان هــەبـە گــەر تــە دەنانـيـر

تـــو نـابــی وەكی موستەسقیيێ نەی رەی

ئــەگـەر شـاهـانێ پێشين ظولمێ پشت خوە

بــبـيــنــن دێ بـبــن ســەد واخ وصەد وەی

ژ بـــۆ ئـەهـــلـــێ دنـــێ تـو جان فدايى

ژ ئـــەهـلـــێ دل دكـى ئـدبـار وهەم لەى

مـەبـە دل خـشـكـێ وەك دارا د خـشـكە

ب عـشق وشەوق وذەوق بە تو وەكى نەى

ب شـوبـهـى شـاخ ل بـا بـە تـو ب عشقێ

وەكـى بـەهمەن بهۆرى هەم ژى ئەڤ دەى

د ئـيـشـە راه قـەويـم وموستەقيم دا

بـكـە مـەش دا نـەبى ضال وتو هەم غەى

تـو ذاكـر بـە د ئاصـال وغـودووان

ژ مـالا يـەعـنـى دەفـتـەر تـو بكە طەى

زەمـانـێ ئـاخـرە حـەق نابە مەقبوول

دبـيـنـى تـو كو حەق گۆ بوويە ئەوعەى

دبـيـنـى جـاهـلـێ نـادانـێ ئەحمەق

ژ زەيـيـا عـالـمـان چێـكريە وە زەى

تـو بسـپێـرە خـودێ هـادى ئـومووران

خودێ قودرەت دكى هەر تشت وهەر شەى

٥٤

# بکە رەحمێ ل مە ئەی دێم دوڕ

بکە رەحمێ ل مە ئەی دێم دوڕا زەررین ب سەرێ
لەو ژ مێژ ڤە تژی دل بوونە ژ دەرد وکەدەرێ
دل ب ڤان دەرد وغەمان هەر ئەوە بۆ تە مەقەرێ
قاصدەك نینە ڤەڕێکن دو سەلامان د بەرێ
ئەی نەسیمێ صبەهێ ما د مەجالا سەحەرێ
سەد سەلامان بگەهینە ژ مە وێ لەب شەکەرێ

وەصف ونیشانێ د وێ دائم مەلان مسکێ تەتار
سەر دو هامان دو بروو گرتنە چ شەمسییە وار
هەردو زولفێ وێ د سەر ڕوو بوونە ئەو مەروەحەدار
پوڕ شێرین وشەککەرینە ب شەبەه قەندێ قومار
نێرگزا نازك وتەڕ نەی شەکەرا مەست وخومار
دێم دوڕ ولەعل لەب وموحتەشەم وموعتەبەرێ

شـــاهـــه ئـــەو هـــەم ژ ســـەلاطيـنـــێ بوزرگه ب عەيان
ژ دورٍ ولـــەعـــل ويـەواقـيـــت كـەمـــەرەك وێ ل ميان
ئـــەی صـــەبـا تـــو كـــو گــهــشـتـــی بـــده روان كەلەيان
دەست ل سەر هەڤ تو بنێ قەصرێ حەبيبێ كو خويان
ئــاســتـــان وشـــەبـــەكـان وكـــولـــەك وپـــەنـجـــەرەيـــان
دا ب مـــســكـــيـــنـــی وزاری تـــو بـــبـــووســی د بـــەرێ

مـــن كـــو وان چـاڤـێ غەزالی دييه ئەز بێ خەبەرم
هـــەر يـــەكـــی جـارەك دمـــره هەرٍۆ ئەز سەد دمرم
قـــەد وبـــالايـــێ تـەنـك خوه ب شەبەه رووح دگەرٍم
دل وجـان كـــر مـــه ب قـــوربـان و ل دۆر ته دگەرٍم
ئـەز ب وێ قـامـەت وبـەژنـێ ل تـه سووندێ دخورم
بـەسكـه ئـەی پـادشـەها من ل ئـەسـيـران غـەدەرێ

هـــەر جـه ومـــەنـزلێ مەحبووبه موبارەك چو ثەمەر
دەر وديـــوارێ وێ دەرمـــانــــه ژ بـــۆ جـان وجـگەر
داروێ دەرد وبـــريـــنـــانـــه حـــەمـــی ئاخا وێ دەر
تـــه زيـــارەت كـــو كـر ئەو دار وبەر وكووهێ قەمەر
تـۆزەكـێ بـين ب خـوه رٍا تـا بـكرين كوحلێ بەصەر
ل طـەريـقـا قـەدەمـا دلـبـــــەرێ وێ رەهگـوذەرێ

دێ بــســۆژە دل وجـان هــەم ژی فـدا بن وێ گەلەك
كــو ببـیـنـن كـو د مــەشـرق ب دەرهات ڕۆژا فەلەك
ســالـكــێ راهــێ مــەحــەبـبەت ( سبل النار سلك )
حوسن وبەهجەت وی نەهشتی ژ بۆ حووران ومەلەك
دێـمــێ بــەدر وئـەنـیـیی زولـف ل سەر بوونە هەلەك
ئـەرقـەمــان حــەلقــە و گەڕ دانــە ل دەورا قــەمەرێ

مــن كـری ســەیـر وسلـووكی د حەمی جهـ ومەكان
مــن نــەدی مـثـلی تە خوندكار وسەلاطین ژ شەهان
نــە پــەری مــن ب مـثـلـی تــە نــە حووریێ د جنان
نــە شـەكـەرخەندێ حەبیبەك د حەمی سال ومەهان
نــە بـوویـیـنـە نــە دبــن وەك تە شـەپـالێ د جهـان
كــێ دیـن مثلـی تە سیمـیـن تــەن وزەررین كـەمەرێ

ئــاگـــر وپـــێــت وپــەرەنـگــێ دلێ مە كریە كەبیب
ژ پــیــان كــەفـتــن وقودرەت مە نەما مەشی ودەبیب
هــەر كــێ دیـتن مە ل حالێ مە دكن حوزن ونەحیب
زار وئــەفـغــان وگــریــن مـە د دنێ بوویە نەصیب
ژ بەر ئاهێن مە د دەڤ ئاگـر ودوود بێت نە عەجیب
مــە د دل دا هــەیــە نــارەك كـو دسـۆژت سـەقــەرێ !

شوبهەتی پەیکێ خودا ( روح الأمين ) ی تو ب بەخت
مـەحـرەمـانـە تو دچی نك حەمی شاهانێ ل تەخت
ب خـودێ کی تو دچی نك شەهێ من بێ دلێ سەخت
سـەح بکێ دوڕ وجەواهر کو ژ لەب وی تێ ب لەخت
دا بـبـیـنـی صـەنـەما مـن نە بگیـن خـۆ بەدی بەخت
بکە تـەلـخـیـصێ جـەوابـێ مـە ژ ڤـێ مـوخـتـەصەرێ

مـە دەرێ رەحـم وئـومـێـدێ ل خوە ئیرۆ ڤەکرین
تـو ل حـالـێ مـە بـپـوڕسـە د دنـێ هێژ نەمرین
ئـەم دوعـاگـۆنـە ژ بـۆ تـە نە ژ قسمێ بەکەرین
بـوونـە پـەژمـوردە وبێ حال حەمی خواب وخورین
قـەدەرەك شـەفـقـە ژ لـوطـفـا تـە تـەمـەنـنا دکـریـن
دا مە مەحـروومی نـەدیـری تـو ژ لوطف ونـەظـەرێ

مـە ل حـالـێ خـوە گـەلەك پوڕسی نەدی ژی کارەکی
ئـەلـەم ودەرد وغـەمـێـن دل ل مە بوون پوڕ بارەکی
مـەخـزەنـا لـوطـفـا حەقە شاهێ مەیێ مونبارەکی
دێ بـچـیـن نـك وی ب زاری ب مـەدە یەك جارەکی
مـا ب زەهـرێ شـەکـەری دۆست بـخـوونـت جـارەکی
عـەرضـحـالا کو نـڤـیـسی مـە ب خـوونـا جگـەرێ

دێ ب عـــيـــدێ بـگـهـــيــن وايــه خـويا كر مه هلال
دێ بنووشين ژ لەبێ لەعلێ وێ خوەش خەمرا حەلال
پــشــتـی هەر عوسرەكێ يوسرەك هەيە ئيرۆ تو مەنال
دێ ل مـــه رەحــمـــێ بـكــه ئـەو زەريا حووری مثال
لـەو كـو پـورٖ شـەفـقـه دديـرت كەرەم ولوطف وكەمال
ئاه ژ دەست رەمز وسورٖێن وێ دورٖ وگەوهەر خەبەرێ

دكــوژن دۆســت وعـوشاقێ خوه حەچی سەروێ سهن
نــابــێـــژن پــيـــره جـوانــه يـا مەلـێ خوەش ب رهن
دل ب خــەنــجــەر لــێ ددن ئــاه وفغـانــان ژێ دبهن
نـــيـنـه وان پاكـی ژ كەس شوبهی شەهان دەر كەلەهن
ب خودێ قـەط تـه د دل دا ژ خـــودێ تــرس نــەهـن
دكــری ظـولـم وجـەفـايـێ تــو ل مــن ڤــــێ قــەدەرێ

نــك تـــه هـــەر حــوور وپــەری د ئــەعـرابن و جولف
ته تونه قەط قوصوور غەير كو د وەعدێ دكی خولف
مـــه ژ بـل تــه نه مەحەببەت ب كەسێ دايه نه ئولف
شـيـرێ پـێ كـوشـتـی موحببان نەكەتی جارەكێ غولف
بـسك وگـيـسوو ژ حـەريـرن قەصەبن طورره و زولـف
تــه ژ كافــووره بــەدەن ، خــال ژ مـسكـێ تــەتــــەرێ

**یـــارێ كــوشـــت دۆســتـــێ خــوه وێ د بەلائێ هشتی**

**نـــە كــەفـــەن كـــر نـــە ب غـاسل ئەوی دائی تشتی**

**هـــادییـــێ مـــەهـــجـوور ژ یـارێ سـەری دانی خشتی**

**یار د گـــەل دۆســـــت وهـــەڤـالان ل هـــەوائی كوشتی**

**پاشی وان گـەزمەیـێ چـەهـڤـێـن تـە مـەلائی كـوشتی**

**مە خـــەدەنـگـن دكرن قەط ل مە ئێدی ئەثـەرێ ؟!**

٥٥

## کر مه هەر ڕۆژ هەزار ناله

کر مه هەر ڕۆژ هەزار نالەء ویار قەط نابهی
بوومه مەحبووسێ ژ دەرد و ژ غەمان دەر ڤی جهی
کی ل شەه عەرض بکه حالێ ئەشیرێ ڤی دەهی
کو بوویه ژار ونەحیف زەر بوویه وەك ڕەنگێ بهی
ئەی نەسیمێ سەحەرێ ما د مەجالا صوبەهی
سەد سەلامان بگەهینە ل مە وی پادشەهی

دلبەرا حوور وپەری پەیکەرا ئەبروو ژ هلال
تنە بۆ وی د حەمی عەصرێ نە ئەمثال وهەڤال
هەر وەکی شاخێ نەباتە ب شێرینی ودەلال
تو دبێ ل جەننەتێ فردەوسێ هەشینەك بوو نهال
عەرعەرا قامەت ئەلف نەی شەککەرا شۆخ وشەپال
نازکا سیمین تەن وخوسرەو و زەررین کولەهێ

ئــەی صەبا تو کەی دچی قەصرا حەبیبا زەری زولف
ب ئــەدیــبــانە تو مەش کە ب هەزار حورمەت وئولف
تــو مــەتــرســە ژ وێ شـمشیـرێ کو ناکەفتیە غولف
ب خـودێـکـی کـو د ڤـێ وەعـد ونیازی بەکی خولف
د بــەری دا تــو بـبووسی ب دوســـــەد زاری ولـوطف
ئاســتــان ودەر ودیــوار وشــوبــاکــێـــن قــەلــەهـــێ

ب شــەبـەهـ مورغێ سەحەر نالینە من ل دۆرا چەمان
بــوومــە مەعدەن ژ هەر غوصصەء وعەجز وئەلەمان
هــەم هــەدەف بــوومــە ژ بۆ تــیر وسهامێ دو کەمان
مــن ب تــەحـریر کری تەعیینێ هەزار ئێش وهەمان
نـامـەیـا جــەور وجــەفـا وئــەلــەم ودەرد وغــەمــان
دی ب دەســتــێ زەرییــێ موحتـەشەمێ سەروو سەهێ

تــورکــا مــن ژ نــەسـلێ شـەهانــە د بنە مەصلحەتێ
وێ ریـاســـەت ل دو جـهــانــە د هــەر مـەمـلـەکەتێ
گــەهـ ب قــەهـرێ دکە مەعموور وگەهـ رەحمێ ددەتێ
دبــە مـەحـبـووب ل مە کە شەفقە شوبهی مام ومەتێ
بـکـە دلـبـەر ژ ڕوویـــێ عـــادلـــی ومـــەرحـەمـەتـــێ
ڕەحـمـەکـێ کـت ب فـەقـیـران وبــــپـــرســـت گـلـەهێ

باطنــی بــۆ تــە خــەرابە ما دەروونەك مە هەیە
ظــاهــری بــوونــە پــەریشان ما ب روونەك مە هەیە
ژ ئـاگــر وپــێـتــێ دەروونــێ مە فورروونەك مە هەیە
د كــلــە ژ دەرد وغــەمـان دیكێ كەدوونەك مە هەیە
مـا ژ بـەر ضــەرب وفـراقـا تـە سوكوونـەك مە هەیە ؟
جـەرگ ودل هــەردو ب نـالـینـە وەكی چەنگ وژەهێ

دنـالــە ژ دەســتــێ حەبـیـبـێ مە دل ورووح ورەوان
مــە د شــام وســەحـەران گـازییە وەك كەبك وكەوان
مـثـلـی هـائـم ل حـەمـی دەشت وچیان بوونە رەوان
بـــوونــە پــەژمــوردە بـزان ڕاستی دین نەی د رەوان
حــەق دزانـــت د شـــەڤـان شوبـهەتی ئاڤێن د ڕەوان
مــە ب دل زاری وكـالـیـنـە حـــەتــا صــوبـحگـەهێ

هــەر كـی جـارەك وی تــو دیـتی ژ بۆ تە هەر دمرت
ڕۆژەكـێ گـەر تــە نەبینە دێ كەراسی ل خوە بدەرت
ژ بــەدەل نــان وئــەدام دەرد وســقـام دێ بـخـــورت
مـثــلــی بـەیـتـێ ب طەوافێ ژی ل دۆر تە بگـەڕت
( حـجـر أســود ) بـــدرت دەســـت زیـــارەت بـكـرت
نــەذر مــن بت بـگـرم خـــواس طـەریـقـا مـەكـەهێ

گەر قەبوول کەت دێ بدم رووحێ ب وی ( بكماً صما )
دێ ل دۆر وێ بـــگـــەڕم ( حــتـــى أمــوت غـمـا )
دێ ب قـــوربـــان وفــدا کـم ژ بـۆ وێ جانی ( جما )
هــەر چ بـــی ژ وی دێ بـنـووشم بلا سەم بت ( عما )
دیـن ئـەگـەر بـێـتـە بـەها جـان ددرم لـــێ ( أما )
مـە هـــەزار جـانــێ عـەزیـزی دهلـبیـتـن د بـەهـێ

گـاڤــەکـێ ڕوونــە د صوحبەت ب وی دل تو بکەلین
جــەســەد وجان وجـگـەر هەم ژی ب عشقێ بقەلین
ل مـــە دی گـــەر ب سـهـــامـــان ل تـــە ئەم نافتلین
تـــو ژ قـــودرەت خـــەمـلـی جـان ودلان تـو بحەلین
پـەردەیا خـێـلـی وچـــارێ تـــو ژ سـەر دێمی هلیـن
دا ژ شــەوقـا تــە ب خـەف بت شـەفـەقا مهر ومەهێ

مــە ســەفەر کر ب سەریعی د حەمی بەر وەکی بەرق
هـــەم د بـەحـران گـەڕیان پوڕ نەما بێتە مە غەرق
مــە نـــەدی وەك تــە لەطیفەك ژ پیان تا سەر وفەرق
تــە ب ڤێ حوسن وجەمالێ حەمی عادەت کری خەرق
قـەط دبـت وەك تـە شـەپـالـێ نـە د شام ونە د شەرق
کـی نـشان دا د جەهـان مثلـــی تە خوندکار وشەهێ ؟

مـوصـحـەفـا حـوسـنـا تە تەفسيـرا كەمالا تە ددت
هــەم پـــەڕێ بــەحـــشـــێ ژ قەدد و ژ نهالا تە ددت
سـاقــی گەر مەی ب مە دت ژ خەمرا حەلالا تە ددت
مــەرهــەمــا ريـشــا دەروون لـەعـلا زولالا تە ددت
عـالـەمـەك شـەهـدەيـیـيا حـوسـن وجـەمـالا تــە ددت
تــو زولەيـخـايـا زەمـانـی و چ حـاجـەت مـــەدەهـــــێ

خـــودێ حـفـظـا تـــە كـە دائـم ژ حەمی غافل قەدان
هەم تو مەحفووظ ومەصوون بی ژ حەمی چەشم بەدان
بـكـە خـدمـەت ژ بـۆ تە جوملە مولووك شوبهی گەدان
تـــە بـكـی قـــووەت وقـودرەت ب حـەمی دەست ويەدان
حـــەق نـگـەهـدارێ تـــەبـت پـادشـەهـا سـەروێ قەدان
ب كـنـارێ مـە فـــەقـــيـــران بـكـە جـارەك نـــگـەهێ

ل تـــە خـەتـمـە د دنێ حوسن وجەمال وحەمی زەين
دلــبـــەران كـــر نـــە دەلالـــی ومـــەلاحـــەت ژ تە دەين
لـــوئـلـوء دوڕ وجـــەواهـــر تە ل گەردەن بوويە رەين
خـــدمـــەتـا تـــە ل شـــەهان بوو ژ فرووضاتێ ل عەين
خـووبـی ودلـبـەری ونـاز وتـەلـەطـوف ب تـە شەين
خـوسـرەوا پـادشـەهـانـی وە خــودانـا جــەبـــەهـێ

هـەر كـى شەھ راهێ د عشقێ دا مەشى دى قەرەحەك

وى د دل دا نــەمــا ئــەحــزان وغـوممومِ وتەرەحەك

هــەمِ ل دۆر خەيـما دلێ خوە ژ سورووور دى بەرەحەك

هـادى ژ خـومـا ئـەلـەست خوار شەرابێ صەبەحەك

ژ ئـەزەل حـەق ب مــەلـێ دايـە ژ عـشـقـێ قەدەحەك

تــا ئـەبـەد مـەست وخــەرابـيـن ژ مـەيـا وێ قـەدەهێ

٥٦

## من ئستمداده دائم

من ئستمداده دائم هەر ژ وی سولطانێ کەونەینێ
کو ئیرۆ ئەز نەظەر دم سیم ئەلیفا ( بین خدین ) ێ
بدم وی دل فداکم جان ببم مەفتوونێ طەرفەینێ
خودێ حەس کە دنووش کم ئەز مەیا صافی ژ لەعلەینێ
ژ مابەینا دو ئەبروویان دبینم قابە قەوسەینێ
( تعالی الله ) بنێ ڕەمزێ چ ڕەنگ ئاڤێهتە مابەینێ

ژ من دل بر دو صەییادان ژ نێڤ ئەحشاو وئەکبادان
کرن من دوور ژ ئەولادان ژ ئەحبابان وئەحفادان
دەری ل من چار طەرەف دادان د نێڤا ئاگرێ جادان
حەبیبا نازکا شادان ببینە وی د ئەعیادان
بنێ نوونێن ل سەر صادان کو کاتب گۆشە لێ بادان
سەراسەر قاف تا قافە رومووزا ( حکمە العین ) ێ

مـەبــە غـافـل د ڤـێ كـەشتێ سەری دێ دانی سەر خشتێ
دنـێ لـەو پورٍ كەسان كوشتی گەلەك ژی هەم یەتیم هشتی
ژ خـاك وئـاخــێ یـەك مـشـتـی ب غەفلەت تو چ ڕوونشتی
ژ عــشـقـێ چێكە یەك كەشتی سوار بە لێ ب هەلـمـشـتــی
بـەڤا نـیـنـن ل بـۆ تـشـتـی حـەتـا كـەنـگـێ بـكـیـن پـشـتـی
د عـشـقـا وان پـەریـڕوویـان وەرن دونـیـایـێ دا دەیــــنــــێ

وەرین هوون ئەی گەلی ناسان ڤەخون هوون مەی ب سەد تاسان
خــەلاص بــن هــوون ژ وەسـواسان ببن دوور هەم ژ خەنناسان
بــبــن دل پــاك ژ ئــەدنــاســان بــەری بن هوون ژ ئەجناسان
حــەبــیــبـا تـاجـا هــەر راسـان ب وان دو بورهێ وەك داسان
ب بـەرقـا شـیـر وئـەلـماسان ب تـیـرێـژێـن د شــەهكـاسـان
سـەراسـەر ئـەهـلـێ دونـیـأیـێ دســۆژن ( طـرفـة العین ) ێ

ژ دەســت وێ دلــبــەر وگۆری ژ وێ خەد سۆرگول ونووری
دبینم ظولم وهەم جەوری نە دا سەر من سی وەك عەوری
وی دا مــن مـحـنــەت ومــەوری هـەمــە دائـم د ڤێ طەوری
تە دیتی هادی طـەبع ثەوری بەلیغ بە ئەو ب شاش گەوری
مــەلا ( باللە ) د ڤـی دەوری ب ڤـی ڕەنـگـی ب ڤـی طـەوری
نـشـان دا وەك نـشـانـی كـەس دەرانـیـن دورٍ ژ بـەحـرەیــنــێ

٥٧

# مه دیتی ژ دەستیٚ دلداری

مــه دیـتـی ژ دەسـتــیٚ دلــداری هەزاران لەوم وشەتم وشەین
فــەقـیــر وژار ودو عــەیــن ل مه بوو جاری وەکی دو عەین
شــوبــه بـیٚــژنــگ وغــربالــیٚ ل مــه دل کون کری بیٚ مەین
ب ســـەد وەعــدان مـه دل شاکه ب رەمز و ئاوریٚ طەرفەین
مــەلا مـــه ل گـــەردەنـا دلبەر ژ نوو سەد بووسه ماین دەین
مـەجالی دیٚ بـــخـــوازم ژیٚ دبیٚ: دەیـنـیٚ ته ( فوق العین )

ل قـــەدد وبـــەژن وبـــالایـــیٚ ژ مـــیٚــژ ڤه ئەم نەظەردارین
ژ خـــەددیٚ سـوٚرگـــول وچاڤیٚ د نـرگس خوەش عەطردارین
ژ وان دو لـــەعـلــیٚ قـەند وشەککەرین ئەم پورٚ شوکوردارین
( ألــسـت ) دا ئــەم ژ ویٚ دارا مـەحـەببەت بەر ثەمەردارین
ب رٚەمـــزا قـــابـــه قــەوسەیـنـیٚ ژوان بــرهان خەبەردارین
( فــآت الـــــقـــــوس بــاریـــهـــا ألا یــا رامي الـقـوسـیـن )

نــه عـــەرش وفــەرش وكــورســـى وقەلەم بوونە د عنوانى
خــودىٚ كەنزەك بوو مەخفى عاشق ومەعشووق د وى ثانى
د غــەيــب بــوو عــلــم وعەين ورووح مثال ونەوعىٚ ئنسانى
نەبوون ئەڤ پەنج تەعەييون هەر ژ رووح ئمكانە گەر زانى
ژ ســــررا ( لا مــكـــان ) واجــب تـەنـــەززول كر د ئمكانى
( فـــأيـــن الــعــلـم أيـن العـيـن وأيـن الأيـن إذ لا أيــن ؟ )

كــەواكـب خوەش ل دۆر بەدرا موحەييا دۆستىٚ ساطع تيٚن
دو شــەمسان ئەز دبينم خوەش ژ شەرقىٚ چەهرە طالع تيٚن
رەقــيــبــى هــەردو زولـفىٚ وى ژ مەطلەع شەمسىٚ مانع تيٚن
ژ دورِ وجــەوهــەران خـامـان ب چـەند خەرمهرە قانع تيٚن
ژ مابـەيـنا دو ئـەبـروويان پـەيــاپـــەى بـەرقىٚ لامع تـيٚن
ب عەينىٚ كەربە بى صافە چ نوورەك صرفە ئەو ( ما بين )

تــەســەلــلـى قـەط نەما بۆ من دىٚ جان وسەر د رِيٚكم ئەز
دبــە عــمـــران وئــاڤــائـــى ل ســـەر قەوسىٚ پرىٚ كم ئەز
ئــەگـەر ئـــەولاد نــە صالح بن دىٚ چ ب قيز وكورِى كم ئەز
ب ئەمرىٚ تە هومايوون ڤان ب سەرگوون دىٚ ل كو رِيٚكم ئەز
ب دەســـتـــوورا تـــە دا وى ژى ژ ڤــىٚ نـاڤىٚ ڤـەرِيٚكم ئـەز
( فـــصـــف الــعــين نـور العـين ألا يا زين كـل الـزين )

ژ دەردان نــابــی قـــەط خـالـی ئـەگـەر ئیرۆ نەبی نەقشی
تــو بــیــن بـیـرا خــوە وێ ڕۆژا سوار بی تو ل ڤی نەعشی
وەرە ب عشقا پەری ڕوویان خەلاص بە ژ حەبسا ڤی فەرشی
لـطـائــف ژی بـكـن سەیران بچن سەر دەستێ وی عەرشی
بـوهاییێ عشوەیەك لەعلان مە یەكسەر ( ما ملك ) بەخشی
دل وجان ژی ل ســەر دانی وظــالــم هێژ دبێـژت دەین !

خــودێ مــوحــی مـومـیـتــە هەر خودانێ قەلبێ قاسی تو
ئــەوە مــونـــعــم ئــەوە مـوحـسن ژ ئنعاما وی ناسی تو
ئـــەوە مـــوعــطـی ئـەوە مانع ل قەطعا خەیرێ داسی تو
تـــو هــادی هــەر خــودێ ناس بە ل ئەیتامان بە كاسی تو
مـــەلا هــەر وی ببـیـن هـەر وی ئەگەر هەر وی بناسی تو
( هـــو الــمـــعـــبـود والـمشهود بل لا غیـر فـی الـدارین )

٥٨

# نظر کل قل بو دورانه

( ب زمانێ ترکی )

نظر کل قل بو دورانه　　بو دنیا در خراب خانه
باقل در میل ایدن آنه　　طولو غمدر بو کاشانه

فلك دن کیم وفا اومر　　سراب دن بیل که صواپچر
بیلور اول کیم اول گیدر　　وفا یوقدر بو دورانه

جهان بالجمله بر آندر　　ایچروسی طلو قاندر
زمان اهلی ده عمیاندر　　گوکل دیر مشلر هب آنه

هزان قطبی وفات ایتدی　　بنی حسرتله مات ایتدی
دخی زهر الحیات ایتدی　　بنی کان قبلدی اشجانه

شهم گیلانی ثانی　　فنا گوردی بو دورانی
بقا باغنده سیرانی　　اولو مقصد ایدی جانه

بـــو دورك مـــهـــر وهـــم مـاهـی　　گــــورود دم بـــــن هـــزان شاهی
آنـــــك نــــوريـلـــــه گــمــراهی　　نــــه صـيـــقــل وپـردی ايـمـانه

گــــوزل قـــطــــب مـداردی اول　　نــــهخـــوش جوهر نثار دی اول
نه بر خـوش خوان هزار دی اول　　لـــطـــائـــف ويــــردی سيـــرانه

گــوزل حـبـل الـمـتـيـــن دی اول　　نــــهخـــوش مصباح دين دی اول
نــــهخــوش دانـــا فـطين دی اول　　حـــكـــيــــم دی قــلـــب نـــادانه

آنـــك صـحـــبـــت دی جـــنـــت　　ويــــرر دی هـــــر دلـــــه نسبت
آلـــــوردی جـــذبـــــه دن قـــوت　　اوچـــــردی ســــوی كـــيـــوانـــه

ســــواد أعــــظـــمــــك أهـــلـــــی　　ايــــــدر مـــــدح مـعـاش عقلی
نــــه بـيـلـــسـون جذبـه يك ميلی　　مــگـــــر كـيــــم اولــــه ديـــوانـه

آنـــك صــوحـبـتـی بـر ساعت　　دگـــر دی يـــوز ســنـــه طـاعت
بــيـلـور دی اول كيم ايده عادت　　شـــــراب شــــــربـی مـــيخانه

خـــــدائـــــی لـــــم يــــزل آنـــی　　كــــه مـطـلــق قـيـلدی بر فانی
مـــســيــحـــا دم ايـــــدی ثـــانـی　　بـــصـــارت ويــــردی عـــمـيـانـه

عــلـــوم بـــاطــــن وظـــاهـــــر　　آكـــاويـــــر مــــشـــدی حق باهر
گـــورن تـــشـــبـيــه ايدوب آخر　　آنــــــی ســـــلــــمــــان ونــعـمـانـه

مــــريـــــدانـــلــــر غـــلامـــى دى　　لـــولـــولـــر پـــك خـــدامـــى دى
هــــزان ارشــــاد مــقــامــى دى　　حـــيـــات ويــــــرردى انـــســانـــه

شـــمـــــزديـــن شـــاهـنـــه بـكــزر　　او نـــورشـــيـــن مـــاهـنـــه بـكـزر
مــتـــيــــن دى راهــــنــــه بـكـزر　　هـــزان بـــكــــزر ده هــــيــزانـه

آكـــا عــــادت ايـــدى دائــــــم　　كـــه صـــوحـبـتـده لـولـه قـائـم
شـــرابــنـــدن ايـــچـــن هـائـم　　اولــــه مـــهـــمـــان مـيـخـانـه

او بـــر گـــنـــج مـطـلـســم دى　　فـــيـــوضـــاتـــيـــلـــه مـعـلـم دى
دخـــى ارشـــاد ده مـحـكـم دى　　او مــــرز ايـــــدى عـــرفـانـه

خـــــدا گـــــر ســوســه انسـانـى　　ولـــيـــه گـــو ســتـــرر آنـــــى
يـاقــــار قــلـبــنــده نـيـرانـى　　او بـــكــــزر عــــرش رحـمـانـــه

آنــــك كـشــــف وكـــرامـاتـــى　　تـــوجــــه ايـتـســـه بـر ذاتـى
گـــورور دى چـــوق مـقـامـاتـى　　گـــلـــــور دى گـــوكـلـى سـيـرانـه

ولـى نـــك طــــانـمسـى لا ريب　　خـــدانـــك طـــانـمـسـنـدن صعب
يــمـــك أيـچـمــك ده آنـلـر هب　　شـريـك در نـوع انـــســانــــه

خـدا گـــر ســوســه بـر عـبـدى　　ولـــيـــه كـوســتـــره كـــنــــدى
بـــشـــر گـــوز كـيـم اولـوب قـيـدى　　طـــوتـــوب گــلـــورده مـــيـدانـه

ولــی بــکـــزرده کـــرمـــابـــه    بـعـبـد گـــلـــورده بـــو بـابـــه
چـــمـــر گـــیـــدرده چـرك آبـه    قـــریـــب گـلـمـــزده هـیـچ آنه

کـــسـلـــســه اولـــد پـشیـماندر    آنـــك نـفـعـنـــدن عـریـاندر
دیـــر گـــوکـــلـی طـلـوقـانـدر    نـــه اولـــدی آب حـیـــوانـــه

چـــو غـائـــب اولـــدی اول ماهم    گـــولاشـــدم گـــورمـــدم شـاهم
بـــنـــی یـــانـــدردی هـر آهم    مـــلازم اولـــــــدم احـــزانـــه

بـــنـــی دهـشـت کـه چـون آلدی    بـــنـــی ســودا چـو لـه صـالدی
جـانـــم گـــیـتـدی جسد قالدی    مـصـاحـب لـــو لـــدم افغـانـه

بـــنـم گـــوکـــلـم طـلـوقـانـدر    قـــزل یـــاقـــوت ومـــرجـانـدر
آنـــك شـــاهـــیـــده بـر جـاندر    اولـــور مـهـــمـــان جـانـــانـه

چـــو هـجـرت غـین وکاف اولدی    دخی شین وواو له صاف اولدی [1]
هـادیـنـــك قـلـبـی قـاف اولدی    مـحـیـــط اولـــدی بـــو حـدثانه

---

(١) غين وكاف وشين وواو : ئەڤە ديرۆكا مرنا شيخ عبد القادرێ هيزانىيە كو دبتە ١٣٢٦ وئەو ب خۆ ل گوندێ نوورشينێ ئەوێ دكەفتە دەشتا مووشێ ل ٢٨ مەها ( جمادى الّولى ) ژ سالا ١٣٢٦ ( ٢٨ خزيرنا ١٩٠٨ ) مربوو .

٥٩

## ئەز نزانم ئەی فەلەك

ئەز نزانم ئەی فەلەك ئەڤ حەسرەت ودەرد وفغان
بۆ چ ئەز سەح دكم ژ ڤێ گونبەدا ئەخضەر نشان
گۆتە من: هجرەت كو كر ژ ڤێ دونیایێ قوطبێ هەزان
جوملە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پورڕ دكن نالین وكالین وفغان پیر وجوان

مەعدەنا لوطفا ئیلاهی مەنبەعا فەیضا خودا
وی ب هممەت ظولم وغەفلەت كر ژ دنیائێ جودا
حەققە گەر جوملە تەرەننوم كن ب ئەڤ صەوت وصەدا
جوملە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پورڕ دكن نالین وكالین وفغان پیر وجوان

كووهێ عرفان عەرشێ رەحمان مەخزەنا علم ووەقار
یەممێ ئحسان ئەهلێ وجدان پیرێ صوحبەت پورڕ نثار
مورشدێ یەزدانی وسولطانێ عوششاقێ كوبار
جوملە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پورڕ دكن نالین وكالین وفغان پیر وجوان

دەهــشــەت وحيـرەت ل من دايە نزانم ئەز چ كەم
قەگ نەما خالى ژ دەرد و محنەت وغەم يەك ركەم
هـــەو دبـيـنـم ئەز دبێژم هەم ژى پورٍ نالين دكەم
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پـــورٍ دكـــن نـــالـيــن وكـــالـيــن وفغان پیر وجوان

سـاعـەتا مەيخانەئێ هەم ژى مەقامێ صوحبەتێ
ئەز دبـيـنـم هەم تەوەججوە گاها شاهێ نسبەتێ
بێ تەوەقـقـوف ئەز دبێژم واه ل من ڤێ فرقەتێ
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پـــورٍ دكـــن نـــالـيــن وكـــالـيــن وفغان پیر وجوان

هـــەر كـــەســێ ژ لـەعلێ زەلالى وى ڤەخوارى شەربەتەك
يا خوە سەح كر وى ب ئخلاص ومەحەببەت صوحبەتەك
ئــەو دبـێـــژت چــونـــكـە دايـە وى حەيات وئولفەتەك
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پـــورٍ دكـــن نـــالـيــن وكـــالـيــن وفغان پیر وجوان

گـــەوهــەر ودورٍ ويــەواقـيـت كو ژ لەب وى داتە دەر
موستەمع مەقبوول د دێران وان د نێڤ جان وجگەر
چونكە ئەمراضــێ د دل داڤێتە دەر وان سەر تە سەر
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پـــورٍ دكـــن نـــالـيــن وكـــالـيــن وفغان پیر وجوان

فرقەتا سەیدا وغەوثــێ ئەعظەمی هێژ هەبوون
هــجـــرەتــا گــەیلانییێ ثانی ژ دل کر من زەبوون
دیــن وسەودا بوومە ئیرۆ ئەز دبێژم ئەرغەنوون
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پـــوڕ دکـــن نـــالـیــن وکـالـیــن وفغان پیر وجوان

دەردەکـــی زۆر وگـــرانـــە نـایــتــە مـیـعـیار وحساب
فـــرقـــەتــا شـاهـــێ هەزانە ئەی گەلی ئەصحابێ باب
قەط ل من ناکن نصیحەت مامە ئەز بێ صەبر وتاب
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پـــوڕ دکـــن نـــالـیــن وکـالـیــن وفغان پیر وجوان

وارثــێ پێغەمبەری بوون ئەو د ڤی عەصری یەقین
داغ کــری جان ودلێ مە ب صوحبەتا شەهد وشیرین
بوومە مەدهووش ودبێژم : کان گەلۆ بابێ شـیــرین
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پـــوڕ دکـــن نـــالـیــن وکـالـیــن وفغان پیر وجوان

شـوبهەتی حەضرەتێ فاورووق ئەز دبێژم ژ دەهشەتێ
ساغە پـــیــرێ مـــن نـــەخواری وی مەرگێ شەربەتێ
چونکە تێ من بیرە تەختێ صوحبەت وهەم نسبەتێ
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پـــوڕ دکـــن نـــالـیــن وکـالـیــن وفغان پیر وجوان

من د ڤی عەصری نەدی قوطبەك ب تەكمیل وكەمال
كــو تەداوی كە دلان گاهی ب جەمال وگەهـ ب جەلال
بــل ژ ( عــبــد الــقـــادر ) یێ ثـانـی گەیلانی مثال
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پــورٍ دكــن نـــالــیــن وكــالــیــن وفغان پیر وجوان

خالق ورەببێ ئەحەد ( یوم الأحد ) دا وی نەجات
غـــەیـــن وشـیــن وكاف وواوی دامە تاریخا وەفات
راضـی ومەرضی د ( جنات النعیم ) دیتی حەیات
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پــورٍ دكــن نـــالــیــن وكــالــیــن وفغان پیر وجوان

مایە بێ صەبر وقەرار ودەردمەند وموستەمەند
هــادی كـەم گەشتەئێ تەیە جودایێ دل كەمەند
لازمـــە ژ بــۆ وی ببـێژە ئەو ب بورهان وسەنەد
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پــورٍ دكــن نـــالــیــن وكــالــیــن وفغان پیر وجوان

شـوبهەتی سەیدائێ تاغی مەرقەدا وی ل پالیە
وی حـەلانــدی جان ودل شوبهی عظامێ بالیە
هەر چ كو چاڤ پێ كەتی دائم ژ دەردان نالیە
جـومـلـە عالەم دەردمەندە ژ فرقەتا شاهێ هەزان
پــورٍ دكــن نـــالــیــن وكــالــیــن وفغان پیر وجوان

٦٠

## هەر ژ فرقەتا شاهێ هەزان

هەر ژ فرقەتا شاهێ هەزان
جان وجگەر من کر فغان
مملوویە دل ژ دەرد وغەمان
خەو نائێ چاڤان قەط شەڤان
چاڤ ژی دڕێژن ئەستران
ژار ونەحیف مامە عەیان
دەردەکی پوڕ زۆر وگران
وا فرقەتێ وا فرقەتێ !
تەنگ بوو ل من جه ومەکان
ڕەش بوو ل من دەورێ زەمان
مامە فەقیر وبێ نشان
زەربوومە وەك بەرگێ خزان
کول بوو ل من جەرگ وجەنان
سەودا ودین بووم بێ گومان
وا فرقەتا شاهێ هەزان
وا فرقەتێ وا فرقەتێ !

هـجـرەت كـو كر ئەو شەه جەناب
ژار ونـــەحـيـف بووم وەك حوباب
جـــەرگ ودلـــێ مـــن كـر كەباب
هـــوون ژ مـــن مـــەكن لەوم وعتاب
دەردێ د مـــن بـــــوون بـــێ حـساب
قـوطـبـێ زەمـان ل مـن بوو غياب
دونـــيـــا د چـــاڤ مـن بوو سەراب
زەهـــره ل مـــن ئـــاب وخـوشـاب
شـــاهـــێ هـــەزان كـــەت بن نقاب
قـيـريـــن دكـــم بـــێ صـەبـر وتاب
غـــەلـطـــان دبـووم د خاك وتوراب
ئەو پــيــرێ صـوحبەت موستەطاب
ئـــەو مـــەعـــدەنـا صدق وصەواب
كەفتى د نـــێـڤ پـــــەردە حـجــاب
بـــوو ل مـــن ئـەلەم ئەكل وشەراب
وا فـــرقـــەتـــێ وا فـــرقـەتـــێ !
دونـــيـــا ل مـــن پــوڕ بـوو ئەلەم
ئـــەفـــغـــان دكـــم ئەز دەم ب دەم
دەردێ د مـــن نـــايـــێ قـــەلـــەم
ڕابـــــوو ل مـــــن رۆم وعـــەجـــەم
كـــارێ مـــنـــە جـەنـگ وسـەلـەم

ڕاکــر ژ دەردان مـــن عـــەلـــەم
ل مـــن ونـــدا بـــوو شـاه وجـەم
ئـــســتـــر دبـــارن شــوبهی چـــەم
گـــۆیـــا مـــن خـــواری زەهـر وسەم
صـــەبـــر وقـــەرار ل من بوو عەدەم
دەر بـــوو ژ جـــەرگـــم خـــوون ودەم
ئـــەی دۆســـت ویـــاران ئـــەز چ کەم
شـاهـــێ هـــەزان چـــوو دا مه غەم
ئـــەو ســـــۆرگـــــولا بـــاغـــێ ئـرەم
حـــەســـرەت ژی دا من هەم ژی هەم
وا فـــرقـــەتـــێ وا فـــرقـــەتـــێ !
ئـــەو شـــەیخێ پوڕ صوحبەت ئەثەر
شـەمس بوون ژ بۆ دین هەم قەمەر
غـــافـــل هەبوون ژێ هەم کۆر وکەر
هـــەم قـــاســـیـیـــێ دل شـوبهی بەر
لـــەو نـــابـــیـــنـه کـــۆر ماه ومەهر
چـــونـــکـــه ولـــیـیـــێ پوڕ هونەر
شـــوبـــهـــی دگـــەرم ئـاڤـانـه هەر
پـــێ ژ وان دچـن ئەمراضـێ صەدر
نـــێـــزیـــکـــی وانـــن بـــێ خـەبـەر
هـــەر چ کـــو دوورن تـــێـنـه سەر

ئـــێـــش وئـــەلـــەم ژ وان تێنە دەر
گـــاڤـــا زوا بـــت هــــەر چ بــەر
پــــۆشــمـــان دبــن ئـەو بێ بەصەر
مـــە ب وی نـــەشوست جان وجگەر
هـــەم ژی دبــێـــژن پـــوڕ کــــەدەر
وا فـــرقـــەتـــێ وا فـــرقـەتـــێ !
جــومـــلـە ژ هــجـرەت بوونە مات
ڕەش بـــوو ل وان وەقــت وحـــەیات
حـــەســــرەت دکــێــشین تا مەمات
ژار بـــوونـــە وەك عــەظم و روفات
واخ واخ دبـــێـــژن قـــات ب قـــات
شـــاهـــێ هــەزان چـوون کر وەفات
صــوحــبــەت شـیـریـن پیرێ هرات
گــەیـــلانـــیـێ ب نـام وصـفـات
ئــــرشـــاد کـــو کـــر ل جوملە جهات
ئـــەصـحـــاب ژ نەفس دیتی نەجات
وەرگــرت ژ دەســت وی وان خــەلات
بــــوون صـــاحـبـێ جەذب وثەبات
ئــەمـراضـێ دل بوون ژ وان شەتات
ئاڤـێـتـــی وان نــــەقـصـێ سمات
بــــوون مـــەخــــزەنـا هەر واردات

لـــەو دەنـــگ ژ وان دائـــــم دهـــات
وا فـــرقـــەتـــــێ وا فـــرقـــەتـــێ !
ئـــەو مـــورشـــــدێ پـــوڕ عەدل وداد
ئـــرشـــاد كـــو كـــر ل جوملە عباد
ئـــازاد دبـــــوون ژ غـــــل وفـــەســــاد
هـــەر كـــــەس ددیـــتـــن وان مـوراد
لـەو صـوحـبـەتەك شێرین سەداد
دائـــم دكـــــر ل جـــــومـــلـــە بـلاد
پـــوڕ نــــوور دبـــوون قەلبێ كەساد
ژێ هـــەر دچـــوون بـــوغض وعناد
ســـەیـــدائـــێ تـاغـی پـــاك نـــەژاد
دابـــــوو ب وی عـــشـــقـــەك شداد
وی ب صــــوحـــبـــەتـــێ دا دل رەشاد
نــــەفـــس ژی دهـــــاتـــــن ئـــنقیاد
وی دا دلان حــــــــــوبـــــــب ووداد
بـــــوون صـــاحـــبـــێ عەقلێ مەعاد
دەنـــگ تـــــــێ ژ وان شـــام ومـــداد
وا فـــرقـــەتـــــێ وا فـــرقـــەتـــێ !
ئـــەو شـــەیـــخـــێ پوڕ حوسن ودەلال
ئـــەو كــــــوثـــــەر وئـــــابـــا زولال
ئـــەو پـــیـــرێ پوڕ صوحبەت ل بال

ئـــەو مـــەشعـــەلا نـــوورا جـــەلال

ئـــــەو صــاحـبــێ ( حسن الخصال )

نـــــوورا خـــودايــــێ لا يـــــــەزال

دائـــــم ل ســــــەر بــوون با كەمال

ئـــەو فـــانـــىيــێ موطـلـەق مثال

ئەو غەوث وقـوطـبـێ پوڕ جەمال

يـــەك صــوحـبـەتەك وى دا وصال

نـــەفـســـى خەلاص كر ژ قيل وقال

دا هـــادى ژى يـــەك جـەذب وحال

ئـــرشـــاد كـــو كر ل سەهل وجبال

جـــەذبـــــە دهـــات ژن ورجــــــال

دائـــــم دبــيــــــن ڕۆژ وكـــيـــــال

وا فـــرقـــەتـــێ وا فـــرقـەتـــێ !

٦١

# د ئیرۆ ئەز د نێڤ جەیشێ هومووومان دا

د ئیـرۆ ئەز د نێڤ جەیشێ هومووومان دا عەلەمدارم
د تـەسـویـد و د تەبیـیـضا غوموومان دا قەلەمدارم
د ( رأس المال ) ێ صەبر وطاقەتێ دا ئەز سەلەمدارم
ژ دەرد وحـەسـرەتا گـەیـلانـیـێ ثـانـی بـریندارم
ژ دەردێ فـرقـەتـا شـاهـێ هەزان دائم ئەلەمدارم

د ڤـی عەصری نەدی من قەط ب مثلی قوطبێ گەیلانی
ب هممەت هەم ب نسبەت غەیر ژ ( عبد القادر ) ێ ثانی
دبـێـم حـیـنـا کو غائب بوو ل من ئەو قوگبێ رەببانی
ژ دەرد وحـەسـرەتا گـەیـلانـیـێ ثـانـی بـریندارم
ژ دەردێ فـرقـەتـا شـاهـێ هەزان دائم ئەلەمدارم

وەلـیـێ پـوڕ مـەزن دائـم دبـن سەتر وقوبابێنە
ژ بـێ ئـخـلاصـی عـەصـرا وان دبن لەو وعتابێنە
چکو وان جەهد نەکر ناس کن کو چەندان بن نقابێنە
ژ دەرد وحـەسـرەتا گـەیـلانـیـێ ثـانـی بـریندارم
ژ دەردێ فـرقـەتـا شـاهـێ هەزان دائم ئەلەمدارم

حەچی کو د صوحبەت وهەم ژی تەوەججوه وێدە ڕوونشتی
بــزان شەیطان ژ خوە دوور کر ونەفسا خوە ژی هەم کوشتی
ژ حــەســـرەت دێ بــبــێــژم تا سەرێ من بێتە سەر خشتی
ژ دەرد وحـەســرەتا گـەیـلانـییـێ شـانــی بــریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

چ خــوەش نــوور وجـەمــالا لا یەزالی بوو د ڤی دەهری
هەزاران واخ نەکر ناس من ب تەمامی وی د ڤی عەصری
ل مـــن حـەققە تەرەننوم کم ب ڤێ بەیتێ حەتا قەبری
ژ دەرد وحـەســرەتا گـەیـلانـییـێ شـانــی بــریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

هــەزاران دەرد وغەم دائم د نێڤ جانێ منە پونهان
شــەب وڕۆژان ژ مــن تێ نالین وکالین وهەم ئەفغان
ل مــن ونــدا بوو شاهێ من دبێژم ئەز ب سەد نالان
ژ دەرد وحـەســرەتا گـەیـلانـییـێ شـانــی بــریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

ئـــــەســـــاســــەك وی ژ نــــوو دانـــی ژ بۆ قەصرا دل ودینە
ب صوحبەت هەم ب نسبەت کر وی حەی ئەڤ قەلبێ مسکینە
چـــو دلـــدارێ خـــــوە دل ونــــدا کـــری گـۆتـــی ب نالینە
ژ دەرد وحـەســرەتا گـەیـلانـییـێ شـانــی بــریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

مەقامێ صوحبەتا شاهێ هەزان شەمزدین دبینم ئەز
وەکــی تــەختێ د هیزان ووەکی نوورشین دبینم ئەز
من گـۆت غائب وەکی بابێ ( علاء الدین ) دبینم ئەز
ژ دەرد وحـەســرەتا گـەیـلانـییـێ ثـانــی بــریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

ژ وێ خــوەش صـوحـبـەتا جاذبەیا شاهێ هەزان هەر دل
مـوصـەفـفـایـە ژ ئـەمـراضان وخالی ژ وەصفا ئاب وگل
وەکی وندا ل دل بوو شەه وی گۆت وهەم شکەست وی مل
ژ دەرد وحـەســرەتا گـەیـلانـییـێ ثـانــی بــریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

حەچی حینا کو ڕوونشتا موراقب چاڤ بدا سەر هەڤ
دگـرتی چاڤێ دل ژ دونیا و ژ عوقبائێ بزان بێ خەف
وی جـانـــێ خــوە دکـر وەقفە د ئرشادا عبادان تەڤ
ژ دەرد وحـەســرەتا گـەیـلانـییـێ ثـانــی بــریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

چ خــوەش نوور بوو د ئسلامێ چ خوەش ( حبل المتین ) بوو ئەو
چ خوەش قوگبــێ مەدار بوو ئەو چ خوەش مصباحا دین بوو ئەو
وەفـاتــا شـــەه حــەچـــی ســـەح کـر وی هەم ژی دین بوو ئەو
ژ دەرد وحـەســرەتا گـەیـلانـییـێ ثـانــی بــریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

ژ دوڕ وجەوهەران پوڕ بوو شەبیهی بەحرێ عوممان بوو
د شــەرع وعــلـمــێ باطـن دا وەكی لوقمان وسەلمان بوو
دبـێـژم بـا ســـەنـــەد دائم دل وی عەرشێ رەحمان بوو
ژ دەرد وحـەسـرەتا گـەیـلانـیـیـێ ثـانـــی بـریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

عــەجــەب خـەللاقێ عالەم صوحبەتەك شێرین ب وی دابوو
حـــەچـی كو دیتی بوون گۆتن یەقین ئەو غەوث وسەیدا بوو
سەلیم سەر چوو ب مەقلووبی د چاڤ خوە چوو ل غەیدا بوو
ژ دەرد وحـەسـرەتا گـەیـلانـیـیـێ ثـانـــی بـریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

چ خوەش بەدرەك موجەللا بوو عەرووسەك پوڕ موحەللا بوو
ژ عـــشــقـــێ دل مـــوغـەلـلا بوو ب وی ئسلام موعەللا بوو
ب ئـــەوصـــافـــێ حـــەمــیـدە ذاتـێ وی دائم موطەللا بوو
ژ دەرد وحـەسـرەتا گـەیـلانـیـیـێ ثـانـــی بـریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

هــەزار وســێ ســەد وبیست وشەشان دا غەم ل من دانی
وەفـــات ورحـــلـــەتـــا شـــاهــێ هــەزان گەیلانیێ ثانی
جەماد ئەووەل د بیست وهەشت د مەرقەد گرتی مهمانی
ژ دەرد وحـەسـرەتا گـەیـلانـیـیـێ ثـانـــی بـریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

وەکـی گــەیـلانــیــێ ثـانی تو نابینی د ڤی ئانی
وەرە هـادی ژ بۆ قوطبــێ زەمان بە مەرثیە خوانی
بــبــێــژ وا فــرقەتا شاهێ هەزان گەیلانییێ ثانی
ژ دەرد وحـەسـرەتا گـەیـلانـیـیـێ ثـانــی بـریندارم
ژ دەردێ فــرقــەتــا شــاهــێ هەزان دائم ئەلەمدارم

٦٢

## کاسەك شەرابا ذللەتێ

کاسەك شەرابا ذللەتێ   جامەك ژ قەهوا محنەتێ
دا من ب کین وکوربەتێ   حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

جان وجگەر کریە برین   قەلب ودلان کریە حەزین
صەبر وقەرار کریە تونین   حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

دونیا د چاڤ من کر عەدەم   دا من غەم ودەرد وئەلەم
بێ هش کرم هەم ژی ئەصەم   حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

بێ عەقل وبێ جان ئەز کرم   بێ شاه وبێ خان ئەز کرم
دل سووز وبوریان ئەز کرم   حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

فرقەت ژ جانان زەحمەتە   مەوت ومرن یەك ساعەتە
هەر گاڤ ددە دل کوربەتە   حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

بێ نوور کری بەیتا دلە   هەم ژی شکاندی باسك وملە
لێ کر هەزار جەرح وکولە   حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

بێ مال وبێ حال ئەز كرم      بێ قال وهەم لال ئەز كرم
هەم پیر وهەم كال ئەز كرم      حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

عالەم ب تەرزەك دی گەڕاند      شاهان ژ تەخت وبەخت راند
هەر ساعەتەك خەلق پوڕ مراند      حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

ناچار وبێ زار ئەز كرم      بێ بەیت وبێ دار ئەز كرم
بێ نەوم وبیدار ئەز كرم      حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

هستر ژ چاڤان كریە خوار      مەمزووج كری ب خوونێ عەذار
دا عاشقان ئەڤ ڕەنگ شعار      حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

دل سار كری ژ مال ومنال      هەم ژی ژ روتبە وجاه وحال
پوڕ كر د دل مەیلا وصال      حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

ڕەش كر ل من ڕۆژەك شەڤە      دۆست وبران كر ژ من ڕەڤە
خەلق ئانی سەیرا من تەڤە      حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

ئەبكەم كرم ئەبتەر كرم      ژار ونەحیف وزەر كرم
مەجنوون ودین ژی دەر كرم      حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

دەردەك ل من كر سەد هەزار      ئەفغان ژ من ئانی دیار
دا من دو عەینێ ئەشكبار      حەسرەت ودەردێ فرقەتێ

رێـیـا هـەزان ل من بوویە نوون شـــاهـــێ ل وێ ونـــــدا دبـــوون
دا مـــن ژ ســـازان ئـــەرغـەنوون حـــەســـرەت ودەردێ فـــرقـــەتـــێ

دەوران ل مـــن پـــوڕ ڕەش کـری مەخلووق هـەمی بێ هەش کری
تـەشـبـیـهـی بێ رووح لەش کری حـــەســـرەت ودەردێ فـــرقـــەتـــێ

هـــادی ب ئـــەفغـــان هـــانـــیـــە وێ ل گـــــووش عـــوزلـەت دانیە
دونـــــیـــــا دبـــــێـــــژت فـــــانـــیـــە حـــەســـرەت ودەردێ فـــرقـــەتـــێ

٦٣

# ألمت بي الأشجان

( ب زمانێ عەرەبی )

ألـمـت بـــي الأشـجـان واهـتـز بنيتي

بـهـجـرة مــن أحـيـا الناس بنسبة

هو الشيخ عبد القادر الثاني بالهزان

هـــو الـقـطـب والغوث العظيم بهمة

هـو الــراح والـروح هو الهادي للورى

هـو الـعـيــن لـلـناس وإنسان مقلتي

هــو الـنـقـشـبندي الطريقة قاصدا

إلــى حـــفـــاء ذكـــر واتـبـاع لسنة

وسـعـــي وجـــهـد واحـتـرام لمرشد

وأخـــذ بـــعـــزم واجـتـناب لرخصة

فـــلـــمـــا ثـــوى بالـمـرقد المتعطر

تـــعـــطـشـت الأكـباد من نار هجرة

هــمــت أعين الأصحاب وابتل ثوبهم

بـــدمـع كـثـيـر صـب من غير مهلة

وكــيــف وقـد كــان طبيباً مداويا

لأفــئــدة مـــرضـى بــداء الضلالة

فــربــى الـمـريدين وأصلح حالهم

بـــرابــطــة الفانـي وورد وصحبة

هــو الـطــود حلمـاً والبحار تكرما

ونـــبــراس قـلــب كـان قبل بظلمة

إذا فــاض مـــن فـيـه جواهر لفظه

تــرى الخلق سكرى من محبة كلمة

ومـــن أحـــضـــر البال بمرآه ساعة

ســرت حـــالـــه فـيـه وفاز بجذبة

ولــكـــنـــه لـمـا تـجلى بصورة الـ

ـعــوام عـمـى عـن دركه أهل غفلة

بـصـحـبـته اهتزت لطائف صدر من

دنــى مــنـــه إخــلاصاً كذلك ترقت

ومـــن يـــرد رب الـعــبـاد نـجاته

مــن الـنـفـس ما ألفاه يوماً بحكمة

ومــن كـان فـي إخلاصه صادقاً ترا

ه فـــاز بـتــطـهـيـر الجنان بجملة

ألا أيـــهـــا الـــزائـــر مــرقده العالي

تـــأدب ولا تـــمـــش بـخلو البصيرة

مــلائــكــة الــرحـمن طافوا مزاره

فــزره بــبــال طاهر طاهر وسكينة

فــيــا حــســرة لـلـحـاضرين بوقته

أضــاعـوا من الأعمار من غير صحبة

فــو الله لــو كـان الذين مضوا حيوا

لــفـــازوا لــديــه بالنفوس الزكية

ولــمـــا أحـــاطـــت بـالأنـام غباوة

فـــمـــا فـــرقـوا بين الصفاء وكدرة

أرى هــجـرة الأسـتاذ عندي عظيمة

وفـــقـــد الـتـميز أعظم في المصيبة

خـــلـــيــفة قطب العارفين بنورشين

شـــهـــيـــر بـــسـيدا عبد رحمن أمة

لــدى صبغة الله هو الغوث الأعظم

مـجـاز مــجـيـــز بالطريقة العلية

فـفـوض أيا هادي الأمور إلى الباري

فـــفـــي قـبــضــة الله الأمور برمة

# ناڤەرۆك

## سەیدا هادی لجەیی ودیوانا وی



## پشکا ئێکێ

## پشکا دووێ

پشکا سیێ